

زنجیره داستانی پێغەمبەران (٣)

# ژیانی ئیبراهیم

علیه السلام

نووسینی

دانا عثمان حسن

هێمن بهاء الدین قەرەداغی

زنجیره داستانی پێغەمبەران

۳

# ژیانی ئیبراهیم

## ( علیه السلام )


نووسینی

دانـــا عثمـــان حســـن

هێمن بهاءالدین قەرەداغی



١٤١٩ك چاپی یەکەم ١٩٩٩ز

بسم الله الرحمن الرحيم

## ناوی سورەت و ژمارەی ئەو ئایەتانەی ناوی ئیبراهیمی تێدا هاتووە

| ناوی سورەت | ژمارەی ئایەت | ناوی سورەت | ژمارەی ئایەت |
|---|---|---|---|
| البقرة | ١٢٤، ١٢٥ ، ١٢٦ ،١٢٧، ١٣٠، ١٣٢، ١٣٣، ١٣٥، ١٣٦، ١٤٠، ٢٥٨، ٢٦٠ | الأنبياء | ٥١، ٦٠ ، ٦٢، ٦٩ |
| آل عمران | ٣٣، ٣٥ ، ٦٧، ٦٨، ٨٤، ٩٥، ٩٧ | الحج | ٢٦، ٤٣ ، ٧٨ |
| النساء | ٥٤، ١٢٥ ، ١٦٣ | الشعراء | ٦٩ |
| الأنعام | ٧٤، ٧٥ ،٨٣، ١٥١ | العنكبوت | ١٦، ٣١ |
| التوبة | ٧٠، ١١٤ | الأحزاب | ٧ |
| هود | ٦٩ ، ٧٤، ٧٥، ٧٦ | الصافات | ٨٣، ١٠٤، ١٠٩ |
| يوسف | ٦ ، ٣٨ | ص | ٤٥ |
| إبراهيم | ٣٦ | الشورى | ١٣ |
| الحجر | ٥١ | الزخرف | ٢٦ |
| النمل | ١٢٠، ١٢٣ | الذاريات | ٢٤ |
| مريم | ٤١، ٤٦، ٥٨ | النجم | ٣٧ |
| الحديد | ٢٦ | الممتحنة | ٤ |
| الأعلى | ١٩ | | |


ناوی کتێب : ژیانی ئیبراهیم

ژمارەی سپاردن : (١٣٧) سالی ( ١٩٩٨ز)

ناوی نووسەر : دانا عثمان حسن _ هێمن بهاء الدین قەرەداغی

لەبلاو کراوەکانی (کتێبخانەی تیشک) سەرووی مزگەوتی گەورە شەقامی کاک ئەحمەدی شێخ

تیراژ : ١٠٠٠ دانە

# ناوەرۆك

## بەندی چوارەم



## بەندی پێنجەم

بسم الله الرحمن الرحيم

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا ، من يهده الله فهو المهتد ومن يضلل فلن تجد له وليا مرشدا ، أشهد أن لا إله إلا الله وحده لا معبود سواه ، وأشهد أن محمدا عبده ورسوله وصفيه .

ئێستاو بۆ جارێکی تر هاتینەوە خزمەت زنجیرە پڕ لەبەسەرهات و حیکمەتەکانی داستانی پێغەمبەرانی خۆشەویست (عليهم الصلاة والسلام) ،وە بەشێکی تر لەبەرزی پلەو جوانی ڕەوشت و پاکی دەروون دەستگیر دەکەین ئەم زنجیرەیە شنۆی ڕازاندۆتەوە بەژیانی پڕ لەبەسەرهات و پڕ لەپەندو ئامۆژگاری کە خۆیان لەژیانی (ئیبراهیم)پێغەمبەردا (عليه السلام) دەبیننەوە ، لەسەرەتای سەرهەڵدانی هەست و نەستیەوە ڕاستیەکان بەدی دەکات و دەبێتە شوێن کەوتەیان ، پاشان بەهەمان ئەو ڕاستیانە هەوڵی ڕزگار کردنی خەڵکی ناو گێژاوەکان دەدات ، هەوڵێکی زۆر ، ماندوو بوونێکی زۆر ، دژایەتیەکی زۆر ، ئازاردانێکی بێ ئەنداز ، هەموو ئەمانە هاوڕێی ساتەکانی ژیانی بانگخوازی ئەم پێغەمبەرە دەبن و ، ژیانێکی پڕ لە ئەزموونی دینداری و خزمەت گوزاری بۆ مرۆڤایەتی بەجێ دێڵێ ، خۆی دەکاتە نەخشەیەك کە دەکرێ گەڕۆکەکانی ڕێگەی دینداری بیکەنە دەلیلی ڕێگەی کاروانیان .

زۆر بەپێویست زانی کەبەشێکی زۆر لەژیانی ئەم خۆشەویستە بدوێین و لەگەڵ هەموو بەسەرهاتەکانی دا پەندو ئامۆژگاری چڕو پڕی لێ بنووسین ، چونکە بەڕاستی ئەمڕۆی موسڵمانان پێویستیەکی بێ ئەندازیان دەبێت بەم چیرۆکانەو ، بەتایبەتی چیرۆکی ئەو پێغەمبەرانەی کە لە دیانی ڕۆژانەیان دا زۆرێك خەریك بوون لەگەڵ بانگخوازیدا و ڕێگرو بەربەستی زۆریان هاتۆتە ڕێ ، هەردەبێت وابێت... ، ئەگەر ژیانی ئەم ئازیزانە نەکەینە پەندو ئامۆژکاری ژیانمان ئەوا بێ گومان و بێ گومان ئەو فەرمایشتەی خوای گەورەمان لەیاد کردووە کە دەفەرموێت :

﴿لقد كان في قصصهم عبرة لأولى الألباب﴾

بۆیە داواکارین لەخوای گەورە بەم نووسراوانەمان ئەمڕۆی موسڵمانان سوودمەند بن و ، لەبەهرەمەندی ژیانی بەهرەداری ئەم بەهرەمەندانە بێ بەهرە نەبن .

وە داواکارین لەخوای گەورە ئەم کارەمان بکاتە توێشوویەك بۆ ڕۆژە سەختەکانی ڕۆژی دوایی‌و خوێنەریش بێ بەشمان نەکان لەنزاناکانی ...و ، هەر هەموو نووسەرو چاپکەرو خوێنەر لەوانە بژمێررێن کەلە سێبەری ڕەحمەتی خوادا دەحەسێنەوە .

والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته

نووسەران

هێمن بهاء الدين قەرەداغی    دانا عثمان حسن

١٤١٩ك - ١٩٩٨/٨/٥ز   سلێمانی

## سەرەتا گوزەرێکی خێرا بەناو گوڵزاری ئەم چیرۆکە قورئانی‌یەدا

چونە خزمەتی ژیانداری ئەم سەروەرانە پڕە لەبەرەکەتو پەندو ئامۆژگاری بۆ دواکەوتوەکانی پەیامی خوایی، وائێستاش یەکەم هەنگاومان هەڵهێناوە بۆ خزمەتی یەکێکی تر لەڕووناک کەرەوەی تاریکی‌یەکانی زەوی‌و بڵاوکەرەوە پرۆگرامی خاوەنداری شتەکان (رب العالمين) بۆ ئەوەی بەشێکی تر لەجوانی خوڕەوشتو ڕاستی گوفتارو وەفاداری کردار بۆ خۆمان بپچڕین لەم باخچە شیرینە.

بەسەر هاتی ئەم زاتە بەڕێزە لەلای خواو بونەوەر، بەسەرهاتێکی زۆر خۆش‌و خۆش گوزەرەو پڕە لەکانیاوی سارد بۆ شکاندنی تینوێتی دەرونەکەیلەکان‌و خەزێنەی پڕ لەحیکمەتو پەندو ئامۆژگاریە بۆ مرۆڤە بێگەردەکان کەلەم چەند دێڕەدا بەشێوەیەکی گشتی‌و کورت باس لەچیرۆکەکە دەکەین‌و پاشان بەشێوەیەکی پڕو چڕ لەپەندو ئامۆژگاری دەچینە خزمەتی....

ئەم ڕێزدارە پێغەمبەری خوای گەورەیەو ناوی (ابراهيم الخليل)ە کەبەباوکی پێغەمبەران ناسراوە چونکە لەنەوەی چەندەها پێغەمبەری‌تر کەوتونەتەوە، لەناو گەلێکی بت پەرستدا گەشەی سەندوە کەدور لەڕۆشنای ڕوناک کەرەوەی تاریکی بونەوەر دەژیان بەڵام خوای گەورە ئەم زاتە دەکات بەچرای ڕوناک کەرەوەی خۆی‌و پیشکەشی دەکات بەتاریکەکان، بەڵێ... ئیبراهیم هەر بەبەڵگەی بیرو هۆشی بیردەکاتەوە کەئەم هەمو جوانی‌و جوان کاری‌یە بێ هودەنیەو لەسەرو هەموشیانەو مرۆڤ کەچەند دیمەن‌و ناوەڕۆکی سەیری هەیەو هەموو شتەکانی چواردەوریشی، بەڵکو دەبێت ڕێکخەرو بەڕیوەبەرێکی هەبێت، پاش چەند تێڕامانێك لەچواردەور ئەم زاتە بەڕێزە پەروەدگاری تاك‌و تەنها ئەدۆزێتەوە پاشان دەبێتە چرای ڕووناك کەرەوەی مرۆڤایەتی.

... پاشان دەست دەکات بەنەهێشتنی ئەو بێڕێزی‌و بێ فەرمانیەی کەبەرامبەر بەدیهێنەری هەموو شتەکان دەکرێت، دەبێتە ئەو ئامرازەی کەمرۆڤەکان لەدەریای لێڵی تاواندا دەرئەهێنێت.

تاکە کەسێك کەئەم پەیامەی پێدەگەیەنێت بریتی‌یە لەباوکی، کەداوای لێدەکات چیتر وازبێنێت لەبێ ئەدەبی بەرامبەر بەپەروەردگاری بونەوەرو چی‌تر لەڕێزی مرۆڤایەتی خۆی نەهێنێتە خوار.

.... بەڵام وەڵام دانەوەی باوکی بۆ ئەم داوا پڕ لەبەرکەتە زۆر رەق دەبێت وەك بەردێکی ڕوخێنەر بۆ سەر کۆشکە خنجیلانەکەی بەرنامەی ئەو سەردەمەی خوا کەتەنها لەدڵە ڕوکەشە بچکۆلەکەی ئیبراهیم دا بوو، پاشان سەربازی ڕێگەی پەیامەکانی پەروەردگاری جیهانیان، تۆقرەی لەبەرنەبڕێت و هەموو ئامرازەکان دەگرێتەوە بەر بۆ ڕزگاریکردنی مرۆڤە ژێر کەوتوەکانی تاوان.

بەڵی ... ئەم جارەیان هەڵدەستێت بەشکاندن و لەناوبردنی بتەکان و نەهێشتنی ئەو ئامرازانەی کەدەبنە هۆی لێك کردنی ڕۆحە سوکەکانی مرۆڤایەتی لەلای پەروەردگاریان، بەڵام لەپاداشتی ئەم هەوڵەشدا دیسان سەربازی ڕێگەی خوای دوژمنان ڕێگەی پێدەگرن و هەموو ئامرازەکان دەگرنە بەر بۆ وەستاندنی ئەم شەپۆلی ئارامیە ، بۆ وێرانەکان ئەم جارەیان هەوڵ ئەدەن بەناخۆشترین سزا پاداشتی ئەم کارەی بدەنەوە، ئەویش ئەوەیە کەدەڵێت، با بیسوتێنین.

... وتەی خۆیان بەسەردەبەن و مەنجەنیقێکی بۆ ئامادە دەکەن کەهەڵیدەنە ناو ئەم ئاگرە کوشندەیەوە، کەلەدوری چەندەها پێوە مرۆڤ نەیدەتوانی خۆی بگریّ لەبەر گەرمیەکەی، بەڵام دوژمنانی خۆشەویستانی خوای گەورە بێئاگان... بێئاگان لەوەی کەسەربازانی سەر ئەم ڕێگەیە هێزو توانایەکیان لەپشتە ڕاگری ئاسمانەکان، زۆر بێئاگان لەگەورەیی خوا، زۆر بێئاگان لەسۆزی خوا.

... فڕێیان دایە ناو ئەو جەهەنەمەی کەمرۆڤایەتی کەمی وای بەخۆیەوە دیبوو، بەڵکو هەر نەیدیبوو، ئالەم حاڵەی خوای گەورە، خاوەنداری هەموو شتەکان فەرمانی بەئاگرکردو سەلامەتی سەربازی ڕێی ڕاستی پاراست پاشان لەگەڵ مەلیکی سەردەمدا بەیەك دەگەن و مەیدانی دەرکەوتنی ڕاستی و ناڕاستی ئاشکرا دەبێت.

مەلیك پێی دەڵێت خوای تۆ کێیەن ئیبراهیمیش زۆر بەسەربەرزییەوە دەڵێت خوای من ئەو خوایەیە کەدەمرێنێت و دەژێنێت پاشان مەلیك دەڵێت منیش دەمرێنم و دەژێنم، پاشان ئیبراهیم دەڵێت. پەروەردگاری من ڕۆژ لەڕۆژهەڵات هەڵدەهێنێت دەتۆ لەڕۆژئاوا بیهێنە، ئالێرەدا مەلیکی بێدەسەڵات لەناوەڕۆکداو دەسەڵاتدار لەڕوکەشدا، هیچی پێنامێنێت.

... پاشان ویستی خوای گەورە وادەبێت کەئیبراهیم (علیه السلام) لەگەڵ خێزانی و برازا ئیماندارەکەی کە (لوط) پێغەمبەرە (علیه السلام) کۆچ دەکەن بەرەو وڵاتی (شام) پاشان خوای گەورە خێزانێکیتر دەکات بەهاوڕێی ژیانی.

ئم بەرێزە مندالّی نەدەبوو و لەتەمەنێکی زۆر پیریشدا بوون پاشان ویستی خوای بەدیهێنەری بونەوەر ئاوابوو کە (ئیسماعیل)ی پیّدەبەخشێتو پاشان (ئیسحاق) هەریەکە لەخێزانێك.

پاشان یەکێك لەخێزانەکانی لەگەلّ (ئیسماعیل) ی کوریدا کۆچ پیّدەکات بۆ مەککە کەئەو سەردەمە چۆلّو کەسی لیّنەبووە پاشان خوای گەورە ئاوی زمزمیان بۆ هەلّدەقولّێنێتو نیشتەجیّ ئەبن لەویّ.

... پاشان تاقیکردنەوەی پەروەردگار جارێکیرتر بەرۆکی سەربازی خوای دەگرێتەوە ئەویش بەداوا لیّکردنی بۆ سەربرینی کورەکەی (ئیسماعیل) کەبەراستی تاقیکردنەوەیەکی زۆر گەورەیە پاشان کەبۆی روون دەبێتەوە ئەم خەوەی بینیویەتی راستەی داواکاری پەروەردگارە بۆ سەربینی (ئیسماعیل)، هەلّدەستێت بەجیّبەجیّکردنی ئەم داواکاریە. داوا لەکورەکەی دەکات کەوەلاّمی بداتەوە لەبارەی ئەم داواکاریەی پەروەردگارەوە کەبریتییە لە سەربرینی (ئیسماعیل) ئایا رازی دەبێت بەم داواکاریە زاتێك کردویەتی کەدروستیکردوە؟

بەلّیّ... وەلاّمی کورەکەی ئەوە دەبێت کەدەلّێت: باوکی شیرینم چیت فەرمان پیّکراوە لەلایەن خوای گەورەوە، ئەوا هەتا زوە جیّبەجیّبکەو منیش ئامادەم لەبەردەم تاقیکردنەوەی پەروەردگارداو (ئینشاالله) لەئارام گران ئەبم.

بەلاّم لەپاداشتی ئەم لوتکەی گویّرایەلّیەدا لەلایەن باوکو کورەوە خوای گەورە، لەلایەن زاتی خۆیەوە (بەرانێکیان) بۆ دەنێرێت لەبانی (ئیسماعیل) بەرانەکە دەبێت بەقوربانی، کەئەو جەژنە قوربانەیە کەگەلانی موسلّمان ئێستا دەیکەن.

بەلّی هەر ئەم دوو بەرێزەش بوون کەهەستان بەدروست کردنی یەکەم مالّیّ کەبۆ خوای گەورە دروست کرابێت لەسەر زەوی. ئەم باوکو کورە هەستان بەدروست کردنیو داوایان کرد کە پەروەردگاریان ئەم کارەیان لیّقبول بکاتو بیکاتە توێشوی رۆژگارێك کەخاوەنەکی بیّئەم توێشوە سەرگەردانو سەرلێشێواو دەبێت.

هەروەها لەسەردەمی ئەم ئازیزەدا برازاکەشی پێغەمبەر بووە کەناوی (لوط)ە واتە لە یەك سەردەمدا ژیاونو هەردوکیشیان پێغەمبەر بوون.

# بەندی یەکەم

## کەسایەتی ئیبراهیم

کەسایەتی ئیبراهیم (علیـە اسلام) وەك (وەچـە) باسـی بـەهیچ شـێوەیەك لـەقورئانو سونەتدا نەهاتووە کـە (صحیح) بێـت بـەلأم ئـەوەی لەکەشـکۆڵی مێژوونوسـانو پەرتوکـە ئاسمانیەکانی (توراةوئینجیل)دا هـاتووە، بەچـەندەها شـێوە بـاس کراوەو ئـەوەی کـەپاك کراوەو پوختە بێت بریتی‌یە لەم وەچانە:

(ئیبراهیم کوڕی تارح کوڕی ناحور کوڕی ساروخ کـوڕی ڕاغـو کـوڕی فـالع کـوڕی عـابر کوڕی شالح کوڕی ئەرفخشذ کوڕی سام کوڕی نوح) [1]

بەڵێ... ئەم زاتە بەرێزە بەوەچە دەچێتە سەرچاوەی پاکی پێغەمبەر (نوح)و خـوای گەورە سەرچاوەکەی لێڵ نەکردوە بەڵکو سەرچاوەیەکی تری پێ‌هەڵقولأندوە.

گەڕاندنەوەی ئەم بنەچەیـە لەسـەر ئـەم شـێوەیە لەگـەڵ فەرموودەیـەکی پێغەمبـەری ئازیزماندا (ﷺ) ڕێك دەوەستێتەوە کەدەفەرموێت: ((السام ابو العرب)) [2]

واتە: سامی کوڕی نوح باوکی عەرەبە، مەبەستی ئەوەیە کە کاتێك لافاو هەموو سـەر زەوی گرتەوە نوحو ئیماندارەکان لەسەر شـاخی (جـودی) نیشـتنەوە پاشـان لەسـێ کـوڕی نوحـەوە (سـام، حـام، یـافث) مرۆڤـایـەتی گەشـەی سـەندەوە ئینجـا ئـەوەی عـەرەب لە(سام)ەوە هەڵقولأیەوە بۆیە دەفەرموێت (علیه الصلاة والسلام) باوکی عەرەب .

بەلأم شتێکی زۆر باوەڕپێکراو نەهاتووە کەئایا دایکی ئیـبراهیم نـاوی چی‌یـەو کێ‌یـەو نەوەی کێ‌یە، لەبەرئەوە زۆر نامانەوێت کەڕۆبچین تێیدا بـەڵکو ئـەوەی کـەهاتووەو گومـانی ڕاستی بۆ ئەبەین ئەمەیە: کەلە (کلبی)ەوە گێراوەتەوە ناوی (بونا کچی کرتبا) کوڕی کرشی لەنەوەی (ارفخشن)ی کوڕی سام کوڕی نوح (علیه السلام) [3]

... بەشێکی تـر لەکەسـایەتی ئـەم زاتـە ڕەوشـت بـەرزە ئـەوە یەکـە لەلایـەن پەروەردگارەوە نازناوی (الخلیل) ی پێ بەخشراوە،.. (الخلیل) یش

---

(١) قصص الأنبياء إبن كثير (ص: ١١٧) الطبعة المخرجة.

(٢) رواه الترمذي.

(٣) قصص الأنبياء إبن كثير (ص:١١٧).

هەروەك لە(مفردات الفاظ القرآن)دا هاتووە بەواتای (خۆشویستراو)دێت و چەندەها داتاشراوێکی تریش لێئەبێتەوە کەپێویستمان پێی نیە باسی لێوەبکەین [1]

ئەمەش زۆرێکی تر لەقورسی ئەم پێغەمبەرە ئازیزە دەگەیەنێت لەلای پەروەردگار، چونکە زۆر جار مرۆڤ بەوە دڵخۆش دەبێت کەخۆشەویستی مرۆڤە ئاسایەکان بێت، خۆ ئەگەر هات و خۆشەویستی دەستەلآت دارەکان بوو ئەوا هەر زۆرتر خۆشحاڵ دەبیت و پشت ئەستور دەبێت، ئەی ئەگەر خۆشەویستی خاوەنداری جیهان بێ؟!!

هەروەها خوای گەورە جارێکیتر کەسایەتی ئەم پێغەمبەرە شیرینەمان بۆ دەردەخات و بەهەموو حیکمەت و گەورەیی و خاوەندارێتی‌یەوە وەسفی دەکات و دەفەرموێت:
: ﴿انه كان صديقاً نبياً﴾ (مريم: ٤١) واتە: ـ بەڕاستی ڕاسگۆو پێغەمبەر بوو، کەڕاستگۆی ئەوپەڕی ئیمانداری و بۆ خوا گونجانە بەڵکو تاکە ڕەوشتی ئیمانداری ڕاستەقینەیەو بێ ئەم ڕەوشتە مرۆڤ لەئیمان دەترازێت،هەروەك لەپێغەمبەر (ﷺ) دەپرسن: (ئایا موسوڵمان حەرام دەخوات؟ دەفەرموێ بەڵێ، ئایا وسوڵمان زینادەکات؟ دەڵێ بەڵێ دەفەرمون: ئەی چی ناکات؟ دەفەرموێت: تەنها درۆ ناکات).

خاوەنی تەفسیری (الكبير) لەبارەی ئەم وەسفەی خوای گەورەوە دەفەرموێت: ـ (انـه مبالغةٌ فی کونه صادقاً) [2]

واتە: ـ ئەم وەسفەی خوای گەورە بۆ ئیبراهیم (عليه السلام) کەدەفەرموێت:﴿صديقاً﴾ زۆر جەخت کردنە لەسەر زۆر ڕاستگۆیی ئەزاتە، کەئەمەش بەڕاستی گەورەترین و بەنرخترین خەڵاتە کەسەرچاوەی هەموو ڕاستیەکان ئەم جۆرە وەسفەت بکات.

هەروەها خوای گەورە جارێکیتر ڕێزی ئەم پێغەمبەرە شیرینەمان بۆ دەردەخات وەجارێکیتریش کەسایەتی پایەبەرزی مەنزڵگای خوایمان بۆ ڕوونتر دەکاتەوەو دەفەرموێت: ﴿ان ابراهيم كان أمةً قانتاً لله﴾ (النحل: ١٢) واتە: بەڕاستی ئیبراهیم نمونەی گەلێکی واتە. کۆمەڵێکی ـ باش بوو بۆ خوای گەورە لەدینداری و گوێڕایەڵی پەروەردگاریدا، واتە لەلای پەروەردگاری ناوی نراوە (أمة) کەئە ووشەیە بەواتای کۆمەڵە کەسانێك دێن[3]

---

(١) مفردات ألفاظ / الراغب الأصفهاني (ص: ٢٩١).

(٢) التفسير الكبير (مفاتيح الغيب) فخر الدين الرازي (ص: ٢٢٣) ج/ (١٢-٢٢).

(٣) مفردات ألفاظ القرآن – راغب الأصفهاني (ص: ٨٦).

ئەمەش گەورەیی و پایەداری ئەم ئازیزە دەردەخات لەلای پەروەردگاری جیهان، کەبەڕاستی ئەوەندە وەسفێکی شیرنیە هەست و نەستی مرۆڤ شایانی ئەوەنیە ڕاڤەی بکات.

بەڵێ جارێکی‌تر خوای گەورە پەردەی ڕەوشتە زێڕینەکانی ئیبراهیممان بۆ ئاشکرا دەکات. چەند پێشانگایەکی ترمان پیشان دەدات لەڕەوشتە پێغەمبەرییەکان کەدەفەرموێت: : ﴿ان ابراهيم لحليم أواة منيب﴾ (هود : ٧٥). واتە بەڕاستی ئیبراهیم ئەم سێ سیفەتەی تێدابوو کەبریتی‌یە لە: ـ

١ ـ (الحليم)

٢ ـ أواه

٣ ـ منيب

خاوەنی (فی ظلال القران) دەفەرموێت: ـ(والحليم الذی تحتمل اسباب الغضب فيصبر ولايثور)

واتە: ـ (حلیم) ئەو مرۆڤەیە کەبەرگەی هۆیەکانی توڕەبوون دەگرێ و ئارامگر دەبێت لەسەری و هەڵناچێت،

هەروەها دەفەرموێت: (والاواه الذی يتضرع فی الدعاء من التقوی)

واتە: ـ (أواه) ئەو کەسەیە کەلەبەر تەقواو شەرمی خوا بەکوڵ دەپاڕێتەوە وەبریتی‌یە لەو کەسەی کەگرژبوو بەکوڵە لەداواکاری‌دا لەپەروەردگار (الدعاء) لەخواترسیەوە، واتە ئەوەندە لەخواترس و خواناسە کەبەو شێوەیە بەکوڵ دەپاڕێتەوە.

هەروەها دەفەرموێت:(والمنيب الذی يعود سريعاً الی ربة)

واتە: ـ (منیب)یش بریتی‌یە لەو کەسەی کەزو دەگەڕێتەوە لای پەروەردگاری ئەویش بەگەڕانەوە بۆ سەر بەرنامەکەیەتی لەکاتی تاوان و تاوان کاریدا [1]

## شوێنی لەدایک بوونی ئیبراهیم

ئازیزان هەروەك بیستومانە کەهەموو مرۆڤێك جێگاو مەنزڵگەی هەیە کەتێدا لەدایك دەبێت، و خەڵکی مێژوو خوڕەوشتی ئەو مرۆڤە لەبۆچوون و هەڵسوکەوتی ئەو کۆمەڵگایەوە هەڵدەسەنگێنێت، کەواتە نیشتمان ئەو دایکەیە کەئازارو ناخۆشی مرۆڤەکان دەگرێتە خۆی

---

(١) في ظلال القرآن لسيد قطب ج/٤ (ص: ٦٠٢) بيروت.

هەروەك چۆن منداڵ تاكە سەرچاوەی بۆی دایكە ، هەروەها نیشتیمان ئەوبەرگەیە كە باڵای مرۆڤەكان ئاورینگداردەكات ، لەبەر ئەم هەموو گرنگــی نیشتیمانە ، بابزانین (ئیبراهیم )ی ئازیز لەكوێ لەدایك بووە ؟

بەڵێ . . .مێژوو نووسان وموفەسرین زۆر لـەم باسە دواون وچەند بۆچونێكیان هەیە لـەم بارەیـەوە ئێمە بەپێویستی نـازانین كەهـەمووی بـهێنن و سـەر لەخوێنـەری ئـازیز بشێوێنین؛بەڵكو كام لەبۆچونەكان زیاتر دەست نیشان كـرا بـوو لەلایەن (زاناكانـەوە) ئـەوا ئەوەیاندەخەینە خزمەت بەڕێزتان كە ئەمەیە(تتلخص فی أنه كان من أهل ـ فدان أرم ـ با لعراق)[1]

واتە: كۆی ووتەكان لەوەدا خۆیدەبینێتەوە كە ئیبراهیم خـەڵكی ناوچەیەكە كەناوی (فدان وارم)ە لە عێراق، كە زەوی(بابل)دەكـات لـە عـێراق.ئەمـەش خـوێ لـەخۆیدا ڕێزێكی گەورەیە كەخوای گـەورە لـەناو ئـەم وولاتـە پـیرۆزەدا ئـەم ڕۆشـنكەرانەوەی مرۆڤایـەتی هەڵدەقوڵێنێت.

## ئایین و پەیرەو پرۆگرامی ئەو كۆمەڵگەیە لەو سەردەمەدا

بەڵێ ... ئاین پیویستە پێـش هـەموو شـتەكانی تـر بـاس لێوەبركێـت لەلێكۆڵینـەوە. لەكۆمـەڵگاكاندا ، چونكـە دیاردەیـەكی بەڵگە نەویستە كەهـەموو كۆمەڵـە مرۆڤێك لەسـەر خاكێك پێویستە پەیڕەو پرۆگرامێك ژیانیان بەرێت بەڕێوەوە ئەم پـەیڕەو پرۆگرامـە دەبێت ڕەوشت بیكات بە (واقع) وەهەموو ڕەوشتێكیش باوەڕ (العقیدە) دروسـتی دەكـات، كەواتـە باس كردنـی ئـاینی ئـەو سـەردەمەی كۆمەڵگەی ئیـبراهیم (علیـه السلام) بەشێكی گرنگـە لەگەشـتەكەماندا هـەروەك (بلـور تـاكی) مێژوونوسـی یۆنـانی دەڵێـت زۆر ولاتمـان دیـوە بێمەلیكو بێسنورە بـەڵام لـەمێژوودا گـەلێك بێئـاین نـەبوە،[2] بـۆ ئـەم مەبەسـتە دەچینـە خزمەت قورئانی پیرۆز هەستو نەستی خۆمانی بۆ ئامادە دەكەین كەدەفەرموێت: ﴿قـالوا نعبد اصناما فنضل لها عاكفین﴾ (الشعراء :٧٠ ـ ٧١).

واتە: ـ ئێمە پەرستشو بەندایەتی چەند بتێك دەكـەینو بـەردەوام دەبـین لـەم جـۆرە بەندایەتیـیە بۆی ، كەئەم فەرمودە پیرۆزەی خوای گـەورە ئـەوە دەسـەلمێنێت كەخـەڵكی

(١) قصص الأنبیاء عبدالوهاب النجار ص٧٩ (٢) العبادة في الإسلام / یوسف القرضاوي (ص: ١٣٥)

کۆمەڵگای ئیبراهیم بت پەرست بوون، واتە (بابلیەکان) بەڵی ... خەڵکی ئەو سەردەمە بتیان لەدار دەتاشی‌و دەیان پەرست کە باوکی ئیبراهیم (علیە السلام) یەکێك بوو لەو دارتاشانەی کەهەڵدەستا بەدروست کردنی ئەم بتە بێسودانە بەناوی چەند ئەستێرەیەکەو ناویان دەنا. بەڵام ئەمڕۆش بەداخەوە چەند کەسانێك هەن هەر خەریکی ئەو بت پەرستەن کەئەو کۆمەڵگەیە لەسەری بوو بەڵام ئەمڕۆ پەرستنەکە بۆ (ئارەزو) دەکرێتن یاخود بۆ چەند کەسانێك دەکرێت کەشایەنی ئەم پەرستشە نین پەروەردگاری تەنها نەبێت کەوێنەی ئەم کارەیی دەوترێت(الشرك) هاوەڵ قەراردان بۆ پەروەردگار.

## مانای ڕاستی یەکتاپەرستی

هەموو ووشەیەك پێویستی بەمانا هەیە واتە (مدلول) ئەگەر بێت‌و باش لە(مدلول)ی ئەو ووشەیە تێنەگەی کەدەیبستێت ئەوا هەرگیز ناتوانی ڕەنگی پێبدەیتەوە لەژیانی ڕۆژانە تداوییکەی بە(واقیع). کەواتە (یەکتاپەرستی)یش کەدژی هاوەڵ قەراردانە پێویستی بەمانایەکی تێرو تەسەل هەیە هەتاکو مرۆڤەکان دەست گیرۆتی ئەو فەروبەرەکەتەی ببن کەهەیەتی‌و بیکەن بەبناغەی هەموو هەڵسوکەوت‌و کارێکیان، کەبەڕاستی هەموو کۆشکەکانی ژیان بەبێبونی ئەم بناغەیە داهاتوو دەڕمێن‌و دەبنە هۆی تیاچونی خاوەنەکانیان لەدونیاو لەرۆژی دوایشدا.ڕاستی (یەکتاپەرستی) [1] بریتی‌یە لەتەنها پەرستنی خوای گەورە، کەئەم پەرستنەش لەسێبەشی سەرەکیدا خۆی دەنوێنێت کەئەمانەن:

**١ـ یەکتاپەرستی پەروەردگارێتی(الربوبیة):** ئەو بۆبوچونەو پەیڕەویە لەپەرستندا کەزانیاری‌داربێت کەتەنها خوای گەورە ئەم بونەوەرەی دروست کردوەو تەنها ئەوە کەڕۆزی بۆ دابینکردوەو ئەیبات بەڕێوە، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت:﴿قل اللهم مالك الملك تؤتي الملك مَن تشاء وتنزع الملك ممّن تشا وتعز من تشاءوتذل من تشاء بيدك الخيرإنّك علىٰ كل شيءٍ قدير، تولج الليّل فى النّهار وتولج النّهار فى الليل وتخرج الحي مِنَ الميت وتخرج الميت من الحي وترزق مَن تشاءبغير حساب﴾ (ال عمران ـ ٢٦ ـ ٢٧).

واتە: ـ ئەی پەروەردگاری خاوەن زەوی‌و ئاسمانەکان‌و ئەوەش کەلەنێوانیاندایە بەڕاستی هەر تۆ شایەنی ئەوەی کەچاکەو خێرو خۆشی بدەی بەهەر کەسێك ئەوا

---

(١) جامع الفريد على كتاب التوحيد / عبد الله بن جار الله بن إبراهيم الجار الله (ص: ٩– ١٠).

دەیدەیتێ و لەهەر کەسیش دابماڵی دای‌دەماڵیی و هەر کەسێك بەڕێزی بکەی بەڕێزی دەکەیت و هەرکەس بێ‌دەسەلاتی بکەی ئەوا دەیکەیت و بەڕاستی خێرو باشە هەر لەزاتی تۆدا هەیەو داگیری کردوە بەڕاستی بەسەر هەموو شتێکدا دەستە بالایت، هەروەها بەحیکمەت و دەسەلاتی خۆت لەکاتی شەو دەخەیتە سەر ڕۆژو لەکاتی ڕۆژ دەخەیتە سەر شەو بێهودە نییە، وەبەدەسەلات و توانای بێ‌سنورت زیندو لەمردو دەردەهێنیت و مردو لە زیندو دەردەهێنیت و بەتواناو دەوڵەمەندی خۆت هەرکەس بتەوێت ئەوا ڕۆزی دەدەیت بەبێ ئەندازەو بەرامبەر.

ئەمە یەکێکە لەو سێ بەشەرە سەرەکیەی کەیەکتاپەرستی پێك دەهێنێت، لەم بەشەدا ئەوە دەردەکەوێت کەئەبێت مرۆڤ کاتێك خۆی بەیەکتاپەرستی زانی ئەم خاڵەی تێدابێت کەخاوەنداری ئەم جیهانە تەنها بەخوا بزانێ نەك خەڵکانی‌ترو ئەبێ وابزانێ کەڕۆزی ئەم هەموو جیهانە خوای گەورە سەرچاوەیەتی نەك سەر بۆ چەندەها خوای دەستکردی تر شۆڕبکات ، ئەبێت وابزانێ کەهەموو ئەو گۆڕانکاریانەی کەلەم بونەوەرەدا ڕوودەدات هەمووی بەدەستی پەروەردگارە . نەك بەهی کەسی‌تری بزانێت و ، ئەبێت وابزانی مرۆڤ خوای گەورە پایەی بەرز نەکات پایەی بەرزنابێت نەك بچێت پەنابەرێتە بەرخوا دەستکردەکان کەپایەی بەرزیکەن وەئەبێت وابزانێ کەتەنها خوای گەورەی لێزویربێت ئەوا زەلیلە نەك زویربونی بەندەکانی خوا بەزەلیلی بزانێت.

بەڵی .. کاتێك ئەم ڕاستیانە لەکردارو گوفتاری ڕۆژانەی‌یدا ڕەنگی‌دایەوە ئەوا پلەیەکی یەکتاپەرستی بریوە بڕێکی باش دورکەوتۆتەوە لەو هاوەڵ قەراردانەی کەئەو سەردەمە ئیبراهیم (عليه السلام) ڕەوانەکرا بۆ چاکردن و پاك کردنەوەی.

**٢- یەکتاپەرستی خوایەتی(الالوهية):** بریتی‌یە لەو تێگەیشتنەی کەتەنها پەرستشی خوا بکات و تەنها خوای گەورە مەبەستی بێت لەهەموو کردارو گوفتارێکیاو تەنها لەو بترسێ و تەنها پشت بەو ببەستێ و تەنها پەروەردگار خۆشەویستی بێت و تەنها لەو داوابکات وەلەسەرو هەمویەوە تەنها پەیڕەو پڕۆگرامی خوایی یاساو ڕێ‌وشوێنی بۆ دابنێت بۆ ژیان و دوارۆژیش.

هەروەك خوی گەورە باس لەم جۆرەی تر یاخود بڵێین لەم پلەیەی‌تری یەکتاپەرستی دەدوێت و دەفەرموێت: ﴿ولایشرك فی حکمة احدا﴾ (ص :٢٦)

واتە: بەڕاستی هیچ کەسێك بەشدارنیە لەبەڕێوەبردن و فەرمانی خوای گەورەدا.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿قل الله اعبد مخلصا له دینی﴾ (الزمر:١٤)

واتە: ئەی محمد (ﷺ) بڵێ                تەنها خوای گەورە دەپەرستم لەهەموو هەڵسوکەوتێکدا ئەمە دووەم پلەی یەکتاپەرستییە، کەزۆر گرنگە لەژیانی مرۆڤەکاندا لەسەر ئەم زەویەو بایەخێکی بێ ئەندازەی هەیە لەلای پەروەردگاریش، چونکە زۆرجار خەڵکی باوەڕ دەهێنن کەزەوی‌و ئاسمانەکان‌و ئەوەش لەنێوانیاندایە خوا دروستی کردوە،و (قریش)یش لەسەردەمی پێغەمبەری ئازیزدا ئەم باوەڕەیان هەبوو هەروەك خوای گەورە بۆمانی بەیان دەكات                ، بەڵام خۆیان نەدەدا بەم بەشەی تری یەکتاپەرستی‌یەوە، هەروەك ئەمڕۆ چەندەها خەڵکی لەوجۆرە هەن، کاتێك لێیان دەپرسیت کەکێ پەروەردگارتە زۆر بەدڵنیایی‌یەوە دەڵێت (الله) بەڵام دەبینینت هەڵسوکەوت ڕۆژانەی ژیانی بەرنامەیەکی‌تر دەبیات بەڕێوەو دواکەوتەی بەرنامەیەکی‌ترە کەئەمە دەردێکی زۆر کوشندەیە، تۆ خۆت خاوەنی پرۆگرامی هەموو ژیان بیت بەڵام دواکەوتەی پرۆگرامێکی کەم‌وکورتی تربیت.

لەبەرئەوە گرنگترین پلەی یەکتاپەرستی ئەوەیە کەئەبێت ڕۆژانەی ژیانی ئیماندار ئەو زاتە ببیات بەڕێوە کەئیمانی پێهێناوەو هێناویەتی‌یە بوون بەڵکو پێویستە زۆر سوپاس گوزاریش بێت لەسەر ئەوەی کەسەرچاوەیەکی ئاوەها ڕوونوگەشی پێبەخشراوە بۆ ئاوەدانی باخەکانی ژیانی‌و باخچەیەکی پڕ لەنازو نیعمەت‌و حیکمەتی وەك قورئانی پێبەخشراوە بۆڕێك خستنی هەموو لایەنێکی ژیان.

هەر کاتێك مرۆڤ ئەم بۆچوونەی بەرامبەر خوای گەورە هەبوو ئەوا ڕووناکیەکەی تری لەتاریکیەکانی ژیانیدا هەڵکردوە بڕێکی باش‌و چاك لەکاروانە دوورخایەنەکەی ڕۆشن کردۆتەوە.

**٣- یەکتاپەرستی ناو و سیفاتەکان( توحيد الاسماء والصفات )**:بریتی‌یە لەو تێگەیشتنەی کەباوەڕی مرۆڤەکان واتێبگەن‌و زانیاربن کەتەنها خوای گەورە بەتەنها خاوەنی ئەم خەسڵەتانیە وەك (خالق، رازق، مدبر) واتە (بەدیهێنەرن ڕۆزی‌دەر، بەڕێوەبەر)و هەموو ئەو خەسڵەتانەی کەتەنها لەخوای گەورەدا هەن هەروەك خوای گەورە بۆمان باس دەكات‌و دەفەرموێت: ﴿هو الله الذى لااله الا هو الملك القدس السلام المؤمن المهيمن العزيز الجبار المتكبر سبحان الله عما يشركون﴾ (الحشر:٢٣)

واتە: (الله) ئەو پەروەردگارەیە کە هیچ جۆرە پەرستراو خوایەکی‌تر نیە جگەلەو خاوەنداری هەموو شتێکە، پاك‌و بێگەردە لەهەموو ناڕێکیەك لەئاشتی‌و ئاشتەواییەو بەدورە لەهەموو زەرەرێك بەزاتی بگات‌و ئاسایش بەخشە بەنێراوەکان (عليهم السلام)و

دواکەوتوەکانیان و ئاگادارو زانایە بەسەر هەموو شتەکانەوەو بەدەسەلأتو بەتوانایە بسەر هەموو شتێکداو خاوەن گەورەیی و رێزەو خاوەن هێزە پاكو بێگەردی بۆ پەروەردگار لەو هاوەڵ قەراردانەی نەزانان [1]

بەڵی .. پلەی سێهەمی یەکتاپەرستی بریتییە لەناسینی خوا بەم وەسفانەی کەکراوەو چەندەهایتر کەدەگاتە (٩٩) ناوی شایەن تەنها بەخوای گەورەو هەریەکێك لەم ناوانە گەورەیی و بەدەسەلأتی بەزەبرو بەرەکەتی خوایمان پیشان دەدات. نەك مرۆڤەکان بڵێن (الله) خوامانەو لەکەسێکی تر بێجگە لەخوای گەورە بپارێنەوە، نەك (الله) خوامانەو بترسین کەسێکیتررۆزیمان ببڕێی، نەك بڵێین (الله) خوامانەو بترسین کەسێکیتر ئازارمان بدات نەك ئەوەی کەشایەنی زاتی (الله)یە لەگەورەیی و دەسەلأتو پاكو بێگەردی ئیمە بدەین بەکەسێکیتر.

هەر کاتێك ئەم بۆچونانە ئەم جۆرە ناسینە بۆ خوای گەورە دروست بوو ئەوا ئەو کاتە ئەم مرۆڤە پلەکانی یەکتاپەرستی لەخۆیدا بەجێهێناوەو کۆتا پلەی سەرکەوتنی چڵەپۆی نوری ئیمانی بریوە.

ئازیزان . باس کردنی ئەم بەشە لەم چیرۆکە قورئانیەدا بەئەرکی سەرشانی خۆمانمان زانی بیخەینە پێش چاوی ئەو مرۆڤانەی کەبەڕاستی دەیانەوێت خوای خۆیان بناسن و ئاشنابن پێی وەزۆریش پەیوەست بوو بەهاوەڵ قەراردانی کۆمەڵگەی (ابراهیم) (علیه السلام) کەچەندە تاریکی ئەو کۆمەڵگەیەی داگرتبوو بەهۆی نەبونی ئەم (ڕۆشنای)یەی کەباسمان کرد.

وەئەم دەردە ئەوەندە کوشندەیە ئەگەر هەبێت لەناخی مرۆڤەکاندا، دەبێتە هۆی سەرگەردانی خاوەنی لەژیان و دواڕۆژدا، وەئەوەندە دەریایەکی پڕ لە تاریکیە تیشکەکانی بەزەیی خوایی هەرگیز لەسەری هەڵنایەت هەروەك خوای گەورە خۆی بۆمان ئاشکرادەکاتو ئاگادارمان دەکاتەوە کەزۆر خۆمان لەدوری بگرین دەفەرموێت: ﴿ان الله لايغفر أن يشرك به ويغفر مادون ذالك لمن يشاء﴾ (النساء: ٤٨)...واتە: ـ خوای گەورە هەرگیز خۆش نابێت لەتاوانی هاوەڵ قەراردان بەلأم لەتاوانەکانیتر خۆش دەبێت بۆ هەرکەس بیەوێت. کەداواکارین لەپەروەردگار لەکۆمەڵی یەکتاپەرستانمان بژمێرێتو بەدورمان بگری لەکۆمەڵی هاوەڵ قەراردان وەك کۆمەڵی کۆمەڵگەکەی ئیبراهیم (علیه السلام).

---

(١) تفسير المقتطف (ص: ١٠٨٥) سورة الحشر ـ مصطفى خرمدل .

## باری گوزەرانی ئیبراهیم لەم کۆمەڵگەیەدا

بەڵێ .. گوزەرانی ئەم کۆمەڵگەیە بەوشێوەیە بـو کەباسمان کـرد، خەڵکی لـەبارێکی زۆر دوور لەخوای و نەزانی و نەفامیدا دەژیان مرۆڤـەکان دڵەکانیان پچرابوو لەبەدیهێنـەریان هەروەك ئـامێرێکی بێبەرنامـە کەنەسود بـەخۆی دەگەیـەنێ نەبـەچوار دەوریشـی، دڵـەکان تاریکی و ڕەشای داگیری کردبوو زۆر دوور بوو لەو سەرچاوەیەی کەڕۆشـنای پێدەبەخشـێ، هـەروەك چۆن ئەشکەوتەکان دورن لەتیشکی بەسۆزی ڕۆژ، هەستو نەستەکان نوقمـی دەریای نەزانی ببوون زۆر دور لەشەماڵی بێداری خوای هەروەك چـۆن ووردە زیخـەکانی ژێـر دەریاکان بێئاگان لەشنەی شەماڵی ئێواران.

ئیـبراهیمیش (عليـه السـلام) یـەکێك بـوو لـەو کەسـانەی کەلـەم کۆمەڵگەیـەدا ژیـانی بەسەردەبرد، بەڵام هەرگیز نەدەچوە ژێر باری ئەوەی کەئـەم پارچـە تەختانـە یـاخود ئـەم پارچە بەردانە شایەنی پەرسـتن بـن، هەرچـەندە سـەیرو ووردبینـی دەکـرد لـەچواردەوری دەیبینی سروشتێکی بێئـەندازە لـەجوانیو بێئـەندازە لـەچڕیو بێئـەندازە لەیاسـا هەیـە، لەبەئـەوە هـەردەم بـیری دەکـردەوە ئایـا ئـەم خەڵکـە سـەر لێشـێواو نـین کەئـەم بتانـە دەپەرستن؟. ! ئایا ئەم هەموو بونەوەرە دروست کەرێکی نیە؟

ئایا ئەم هەموو یاسایە دەستێکی داناو زانا نایبات بەڕێوە؟

ئەی ئەگەر ئەمانە وان ئەو دەسەڵاتە کێیە؟

بـەڵی... ئیـبراهیم لەبەرئـەوە ئـەم پرسـیارانەی دەکـرد چونکـە هـەموو شـتەکان لەچوارچێوەی یاسایەکدان، هەموو شتەکان هاوارەدەکەن کەخاوەن دارن، بەتایبـەتی کـاتێك بیری لەم مرۆڤە دەکردەوە کەبەم شێوەیە چڕوپڕ سەیرو سەمەرەو جوانیـیە دروسـتکراوە، تۆ بڵێی بەبێهودەبێ ئەم هەموو جوانکاریەو یاسایە؟

ئایا مرۆڤەکان هیچ کام لەشتەکان بێهودە دروست دەکەن؟

بۆیـە هـەردەم لەبیرکردنـەوەدا بـوو بـۆ گەیشـتن بەڕاسـتی کارەکـەو دۆزینـەوەی خاوەنی ئەم ڕاستیانە.

بەڵی .. ئەوە ئەو (فیطرة) یە کەخوای گـەورە بـەدیاری پێشکەشـی مرۆڤـی کـردوە، ئەو گەوهەرەیە کەهەردەمو هەموو کات لەژێر لێڵی دەریاکاندا نوێدەنوێننـن هـەرگیز قبـوڵ نیە کەسەر بۆ شتانێك شۆڕبکات بێجگە لەپەروەردگار.

ئـەم (فیطـرە)تـەی ئیـبراهیمیش هـاتبووە جۆشو سـەرگەرمی گـەڕان بـوو بـەدوای پەروەردگاری ئازیزدا، سەرگەرمبوو بۆ بردنی کڕنوشـێك بۆی لەپاداشـتی هـەموو ئـەم نـازو

نیعمەتانەی کەبەسەریدا ڕژابوون بۆیە هەردەم کاتێك باوکی (بتە)کانی دروست دەکرد، دەیدا بەئیبراهیمو براکانی کەبۆی بفرۆشن، ئەوەبو براکانی ئیبراهیم هەموو بتەکانیان دەفرۆشت بەڵام ئیبراهیم نەی دەفرۆشت چونکە لەناوبازاڕ هاواری دەکرد کەکێ ئەم (بتەی) دەوێت کەزەرەری پێدەگەیەنێتو قازانجی پێ ناگەیەنێت [1] لەبەرئەوە کەس بتەکانیان لێنەدەکڕی وەچەندەهاجار بتەکانی دەبردو، دەیخستنە ناو (ئاوە)وە و دەی گوت: ئەوە بۆچی ناخۆنەوە؟ دەیبخۆنەوە ئەگەر ئێوە بێگیان نین؟

بەڵێ.. هەر ئەم خەبەربونەوەیەی فیطرەت بوو کەوای لێکرد کەچەندەها جار بەئازادیو بەجەرگیەوە دورلە گیانی نەزانی بەباوکی بڵێ ئەی باوکە ئەم شتە بێگیانە چین ئەیپەرستن کەهیچ سودو زیانێك ناگەیەنێت.

هەروەك خوای گەورە بۆمان باس دەکاتو دەفەرموێت: ﴿واذ قال ابراهيم لابيه ازر اتتخذ اصناما الهة، انى اراك وقومك فى ضلال مبين﴾ (الانعام :٧٤).

واتە: کاتێك دوای ئەم بیرکردنەوانە بەباوکی فەرمو ئەی باوکە ئایا تۆ ئەم بتە بێگیانە هەڵدەبژێری بەخوای خۆت؟ بەڕاستی من تۆش و گەلەکەشت لەتاریکیەکی گەورەدا دەبینم. بەڵی.. ئازیزان ئەمەیە هاواری (فیطرەت) بەڵێ ئەمەیە جۆشی بەندەی پاكو بێگەرد بۆ پەروەردگاری، ئەمەیە ڕاستی فەرمودەی پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) کەدەفەرموێت: ((كل مولود يولد على الفطرة)).

واتە: ـ هەموو لەدایك بویەك لەسەر پاكیو بێگەردی لەدایك دەبێت بەڵام زۆرجار ئەم پاكیو بێگەردیە نامێنێت، بەڵكو چواردەوری ئەو مرۆڤە پیسی دەکاتو پڕی دەکەن لەخەوشو خاك. لەبەرئەوەیە کەدەبینیت مرۆڤ لەکۆمەڵگە بێبەرنامەو بێ پەیڕەوەکاندا بەو شێوەیە دوور لەیارمەتیدانی یەکتریان تێدانیە، ئەمانە بەهۆی ڕەوشتی ئەو خەڵکەی چواردەوریانەوە دەبن بەم مرۆڤە، ئەگینا بەپێچەوانەوە خۆیان لەبنەڕەتدا پاکن.

هەروەك (سید قطب) لە(فى ظلال)دا دەفەرموێت: (انها الفطرة تنطق على لسان ابراهيم (عليه السلام)، انه لهم يهتد بعد بوعيه وادراكه الى الهه ـ ولكن فطرته السليمة تنكر ابتداء ان تكون هذه الاصنام التى يعبد قومه الهه) [2]

واتە: ئەوە فیطرەت بو لەسەر زمانی ئیبراهیم هاتە گوفتار، هێشتا خۆی بەتەواوی نەیدەزانی پەروەردگاری کێیە بەڵام فیطرەت پێی دەگوت کەنابێ ئەم بتانەی کۆمەڵگای دەیپەرستن خوابن.

---

(١) تأريخ الطبرى (ص: ١٤٤) ج١

(٢) فى ظلال القران/ سيد قطب/ (ص: ٢٩٠) بيروت.

## پەندو ئامۆژگاری یەکانی بەندی یەکەم

(١) باس کردنی ڕەوشتی پێغەمبەران لەقورئاندا بۆئەوە هاتووە کەمن و تۆی ئیمانـدار چاویان لێبکەین و ڕۆژانەی ڕەوشتیان بکەین بەڕۆژانەی ژیانی خۆمان.

(٢) ئازیزا ن. ئیبراهیم (علیه السلام) نازناوی خۆشەویستی پـێدرا لەلایـەن خـوای گـەورەوە کەبەڕاستی خـەڵاتێکی گـەورەو نـەبڕاوە لـەنرخدا کەواتـە بائێمـەی ئیمـانداریش هـەوڵبدەین وەك بـاوکی پێغەمبـەران کـەمێك خۆمـان لـەلای پـەروەردگارمان خۆشەویسـت بکەیـن ئەم خۆشەویستی‌یەی خواش ئاشکرایە کەبەچی‌دەست دەکـەوێت، بەشـوێن کـەوتنی پێغەمبەری خۆشەویستمان چنگ دەکەوێت کەژیانمان بکەین بەوێنەیەك لـەژیانی ئـەو ئـازیزە (علیه الصلاة والسلام) هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قل ان کنتم تحبون الله فاتبعونی یحبکم الله﴾ (ال عمران: ٣١)

واتة: بـڵێ ئـەی محمد (علیـه الصلاة والسلام) ئەگـەر ئێـوە خـوای گـەورەتان خـۆش دەوێت ئەوا شوێن من بکەون لەهەموو کردەوەو کارو پـەیڕەوی ژیانتـاندا ئـەوا خـوای دەورە ئێوەی خۆش ئەوێت.

(٣) خوینەری ئازیز.. کاتێك خوای گەورە باسی یەکێك لەڕەوشتە بەرزەکانی ئیبراهیم دەکات (علیه السلام) دەفەرموێت: (انه کان صدیقـا) واتـە: بەڕاسـتی ئیـبراهیم ڕاسـتگۆبوو- مانـای ڕاسـتگۆی ئـەو پەیژەیەیـە کەخـەڵکی دەتـوان پێیـدا سـەربکەون بـۆ سـەر مینبـەری پێغەمبەران، مانای بەم ڕاستگۆیی‌یە تۆی ئیماندار دەتوانیت لەڕۆژی دوایدا لەگـەڵ (محمد)و پێغەمبەرانی تردابیت (ﷺ).

وەتاکە ڕەوشتێك کەپێویستە لەهەموو کـات و شـوێنێکدا هـەبێت لـەئیمانداردا بریتی‌یـە لەڕاستگۆی بەپێچەوانەوە نەبونی (درۆ) لەئیمانداردا، چونکە لەپێغەمبـەری ئازیزمـان پرسـی ئایا موسوڵمان چی دەکات و چی ناکات فەرمووی (زینا دەکـات دزی دەکـات، بـەڵام هـەرگیز درۆ ناکات. چونکە کەدرۆت نەکرد هەرگیز ئەم کارانە ناکەیت.

(٤) خوای گەورە کاتێك ئیبراهیمی (علیـه الصلاة والسـلام) نـارد بـۆ پێغەمبەرایـەتی، لەهەموو سەر زەوی تەنها ئەم بەڕێزە بۆ خوا گونجاوبوو، لەبەرامبـەری ئەمـەدا هـەموو سـەر زەوی هاوەڵ قەراردان بوو بۆ خـوای گـەورە، لەبـەر ئـەم هۆیـە خـوای گـەورە نـاوی دەنێـت بە(گەلێك) ئەوەندە بۆ خوا گونجاو بـووە، دەی بـاتۆی ئیمـانداریش هـەر تەنـها کـەمێك لـەم

وەسفە جوانەی ئیبراهیمت پێبەخشری، تەنها کەمێکی ژیانمـان لـەپێناوی خـوای گـەورەدا بخەینەکار، نەك هـەموو ژیانمـانو نـەك لەگـەڵ هـاوەڵ قەواردانیشـدا بـەڵکو لەپێشـدا خـودی خۆمان هەوڵ بدەین بۆ خوای گەورە بگونجێنین پاشان هەوڵ بدەین خەڵکی ووریا بکەینەوە لەدینی خوای گەورە هەروەك پێشەوامان دەفەرموێت: ((بلغو عـني ولـو آيـة))..واتـە: ئـەم بەرنامەی منو من بەخەڵکی بناسێنن بەتەنها ئایاتێکیش بێت.

(٥) ئارامگری: بریتی‌یە لـەو گەوهـەرەی کەخاوەنەکـەی پرشـنگدار دەکـات ئـارامگری بریتی‌یە لەو هەڵوێستەی کەخوای گەورە وەسفی پێغەمبەرایەتی پێدەکات، ئایـا پرسیارێك بۆ ناکەیت بڵێیت: بۆچی لەهەموو کەس زیاتر پێغەمبەران پێویستیان بەئارامگری‌یە؟

وەڵامەکەی ئەوەیە خوای گـەورە بـەئیبراهیم دەڵێـت (حليـم) واتـە ئارامگـر لەبـەردەم تورەیدا، لەبەرئەوەی ئەم بەرێزانە بریتیە لەو پەیوەندی‌یەی کەخوای مرۆڤەکان دەبەستن بەمرۆڤەکانەوەن واتە کارەکـەیان زۆر گرانـەو پێویسـتی بـەئارامگری هەیـە هـەروەك خـوای گەورە بەپێغەمبەری خۆمان دەفەرموێت: ﴿فاصبر كما صبر اولو العزم مـــن الرســـل﴾ (الاحقاف : ٣٥)..واتـە: ئـەی محمـد (عليـه الصـلاة والسـلام) ئـارام بگـرە، هـەروەك چـۆن پێغەمبەرانی پێش خۆت ئارامیان گرت. [1]

کەواتە: ئارامگرتن پیشەی ئەو کەسانەیە کەدینی خوای گەورە دەگەیەنن ئیـتر لەهـەر سەردەمێكو لەهەر شوێنێکدا بێت، بەتایبەتی ئەمڕۆی هەڵگرانی پەیامی خوای لەکوردسـتانی ئازیزدا، بەتایبەتی ئەمڕۆی گەنجانی خوێن گـەرم بـۆ گـەیاندنی پـەیڕەوی خـوای، لەهـەموو کەس زیاتر پێویستیان بەم ئارامگرتنە هەیە، چونکە کارەکەیان گرانە، زۆر گرانە گرانیەکەی لەوەدا دەردەکەوێت کەپاداشتەکەی (بەهەشتە) وەئەبێت بانگەوازکەران بۆ لای ئـاینی خـوا لەم سەردەمەدا دووشتی سەرەکی لەیەك جودا بکەنەوە کەئەویش بریتی‌یە لە: (جرئة) (حكمة).

(جرئة): کاتی خۆی هەیە کاتێکی دەیە کەخوای گـەورە ڕێی پێدا، کـا تێکی هەیـە کەنواندنی ، ئـەم ئازایەتی یـە ئـاگرێك نـەبێت دارسـتانە سـەوزەکان، بسـوتێنێ دووکـەڵێك نـەبێت خونچـە تـازە پێگەیشـتوەکان بخنکێنێ، وەپاشـان نەبێتـە هـۆی لەدەسـت دانـی ئـەزمونێکی گشـتیو پڕ لەسـودی موسوڵمانان.

---

(١) (اولو العزم): بریتین لەو پێنج پێغەمبەرەی کەزۆر ماندوێتیان چێشتوە لەگەیاندنی پـەیامدا کەئەمانـەن (ابراهيم، موسى، عيسى، نوح، محمد) (عليهم الصلاة والسلام)

ئیسلام (ڕۆشنایی‌یە) تاریکیەکان ناهێڵێت، پاراستنی ئەم ڕۆشنایی‌یە بڕێکی زۆر لە (حلیم)ی ئەوێت‌و دووئەوەندەش (حکمە)تی دەوێت.

(حکمة): بوونی (حکمە) لەهەموو کاتێکدا پێویستە بۆ مرۆڤ وەزۆر جیاوازە لە(جرئە)، بەڵکو بوونی ئەم حیکمەتە ئەصلەو مرۆڤ بەگشتی‌و هەڵگرانی پەیامی خوای بەتایبەتی پێویستە بیکەین بەسەرۆکی میکانیزمی کاریان، واتە لەهەموو هەڵسوکەوت‌و بانگ کردنێك‌و تێکۆشانێك (جهاد)دا پێویستە حیکمەت باشترین وەسیلەی گەیشتن بێت بەئامانج، بەڵگەش لەسەر ئەم ڕاستیە زۆرە، ئەگەر سەردانێکی کۆمەڵگەی ئیسلام بکەین لەسەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوا زۆر بەڕۆشنی ئەم ڕاستیە دەبینین بۆ نمونە:

(پاش جێگیربوونی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەمەدینەو دروست بوونی دەوڵەتی ئیسلامی، قورەیش نامەیەك دەنێرن بۆ (عبداللە) کوڕی ابی کوڕی سلول) کەلەنامەکەدا دەڵێت ئەگەر بێت‌و، (محمد) و هاوەڵانی لەناوخۆتاندا دەرنەکەن ئەوا سزایەکی خراپتان پێ‌دەگات لەلای ئێمەوە.

بەڵێ.... عبداللە کەسەرۆکی دووڕوەکانی مەدینەبوو هەڵدەستێت بەکۆکردنەوەی چەند دووڕوییەکی‌تر بەمەبەستی دەرپەڕاندنی موسوڵمانان لەمەدینە، لەم هەڵوێستەدا کۆمەڵێك لەموسوڵمانان وایان پێ باشە کەبدەن لە(عبداللە)و کۆمەڵەکەی بەڵام پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەك سەرکردەی حەکیم هەست بەوە دەکات کەئەمە دەستێکی دەرەکیە (عبداللە)ی جوڵاندوە،و ئەیەوێت کەیەك کۆمەڵی خەڵکی مەدینە بشێوێنێ، ئەگەر بێت‌و موسوڵمانان هەستن بەگژاچونی لەگەڵ ئەم دووڕوانەدا، ئەوا بونەتە گەورەترین یارمەتیدەر بۆ جێ‌بەجێکردنی مەرامی پیسی دوژمن، لەبەرئەم هۆیانە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ڕوی‌کردە (عبداللە)ی دوڕو بەچەند ووتەیەکی پڕ لەحیکمەت ئەم بەسەرهاتە ترسناکەی هێور کردەوە، کەپێی فەرموو (بەڕاستی قورەیش چاکی لەخشتەبردون، هەتاواتان لێهاتووە کە، دەست بدەنە یەخەی براو خوشکەکانتان).[1]

ئابەم ووتە پڕ لەحیکمەت‌و پڕ لەزانایانە (عبداللە) ساردبوویەوەو شەرمەزاری گرتی‌و بڵاوەیان کرد، ئەمەیە بەگوێ کردنی فەرمانەکەی خوای گەورە کەدەفەرموێت: ﴿وجادلهم بالتي هي احسن﴾ (النحل: ١٢٥)

واتە: لەگەڵیاندا بڵێ بەکام شێوە لەهەمووی چاکترە.

---

(١) المنهج الحركي لسيرة النبوية/ محمد منير الغضبان

خۆ پێغەمبەری خوای گەورە دەیزانی کەکێ دووڕوە، خۆ خوای گەورە خۆی هەموو ناوەکانی پێوتبوو، خۆباش دەیزانی کەسەر ۆکی هەموویان (عبدالله)یە، خۆ دەسەلاٌت داریش بوو لەمەدینە ئەی بۆچی فەرمانی نەدا بەلێدانیان؟

لەبەرئەوەی حیکمەت لەوەدابوو کەیەك کۆمەلی مەدینە بپارێزێت وەڕیزەکانی کۆمەلٌ لێك جیانەبێتەوە، نەك ئەوەی کەلە سەردەمی ئێستادا هەندێك لەگەنجانی دلسۆز لەنەزانینەوە بەکەمو کورتی خەلٌکی دەلێن (نفاق)، لەجیاتی ئەوەی بلێین (منافق)، باهەولٌ بدەین ئەو کردەوانەی کەتێدایە لە(نفاق) دەچێت لەکەسایەتی بەرامبەردا نەهێلین و هەولٌ بدەین ئەو ئامۆژگاریە پڕ لەجوانیەی پەروەردگارمان بەرجەستەبکەین لەژیانماندا کەدەفەرموێت: ﴿ادع الى سبيل ربك بالحكمة والموعضة الحسنة﴾

واتە: ـ بانگهێشتی خەلٌکی بکە بۆ لای ڕێگەی ڕۆشنی پەروەردگارت بەجوان بێژی و ڕاست بێژی ژیرانە و گوفتارو ڕەفتاری جوان و پڕ لەحیکمەت، بەلێ.. کاتێك کەبانگخوازان ئەم ڕاستیەیان زانی ئەوا هەموو گوفتارو ڕەفتارێکیان پڕ لەحیکمەت دەبێت و (جرئە) ئازایەتی و جەربەزەیش هەلٌدەگرن بۆ کاتی پێویستی خۆی، واتە بۆ ئەو کاتەی کەتەنها چارەسەرە، بۆ ئەو کاتەی کەخوای گەورە ڕێی پێداوە، بۆ ئەرکاتەی کەنەبێتە زیانمەندی بۆ ئەزمونی گشتی موسلمانان.

(٥) پاڕانەوەو زوو گەڕانەوە بۆ لای خوای گەورە باشترین کارێکە بۆ مرۆڤەکان لەلای پەروەردگاریان، کەئەم جۆرە کارە خوای گەورە (ئیبراهیم)ی پێوەسف دەکات و دەفەرموێت: لەخۆڕەوشدا (اواه).[1]

بەلێ... ئەم جۆرە ڕەوشتەیە کەپیاو کوژەکان دەکات بەپیاو چاکان، ئەم جۆرە پاڕانەوە بەکولەیە کەدەشتە وشکەکانی تاوان دەکاتو باخچە سەوزەکان هەر ئەم گەڕانەوەو پاڕانەوە لەکاتی گوناهەکاندا مرۆڤەکان دێتەوە بریان و دەیان کەن کەدەبێتە هۆی نەمانی ئەو گوناهانەیان، ئەم ڕەوشتە پێویستە بۆ دووجۆر مرۆڤ بەدوو جۆری جیاواز، بەشێوەیەك چۆن ماسی پێویستی بەئاوە، چۆن گیان لەبەرانی سروشت پێوستیان بەهەناسەیە، چۆن گولەکانی پێویستیان بەڕۆژە، چۆن مرۆڤەکان پێویستیان بەپەروەردگاریانە، دوو جۆرە کەئەمانەن: ـ

---

(١) (اواه) واتە: ئەو کەسەی زۆر لەخواترسەو بەکولٌ لەپاڕانەوەدا.

(١) خەڵکی موسوڵمان بەگشتی: واتە مرۆڤەکان کەخوای خۆیان ناسیوەو ئەزانن کەپەروەردگارێکیان هەیە، ئەوانەی کەتەنها کڕنوش بۆ خوای تاکو تەنها دەبەن پێویستە ئەم ڕەوشتە بەرزەیان تێدا بێت لەوکاتەدا کەزۆرنزمن، پێویستە بەهۆی بەرزیی و بەرێزی ئەم رەوشتەوە خۆیان لەوکەمیو بێنرخیە دەربازبکەن کەتێی کەوتون، کەئەویش داوی تاوان کردنە، شکاندنی سنورەکانی خوایە.

بەڵێ... پێویستە بەزۆترین کات لەم تاوانەدا بێتەوە یادی مرۆڤەکان کەدەست بکەن بەپاڕانەوەو گەڕاندنەوە بۆ لای خواو ترسان لەسزای خوای، ئەمەیە ئەو چڵەدارەی کەنوقم بووەکانی ناو زۆنگاوی تاوان ئەتوانن خۆیانی پیڕزگاربکەن، ئەو کاتەی ئەم پاڕاندنەوەیەو گەڕاندنەوە ڕوی‌دا ئەوا خەشمو قینی خوای دەنیشێتەوەو ڕووڕەشی بەندەی تاوانکار لای پەروەردگاری نامێنێتو گەورەترین خۆشحاڵیش زاتی پەروەردگار دەخرێتەوە، هەروەك پێغەمبەری ئازیزمان (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: ـ (خوای گەورە خۆشحاڵترە بەگەڕانەوەی بەندەکەی بۆلای ڕێگاو بەرنامەکەی، لەکابرایەك کەبەزەویەکی لماوی بیاباندا بڕوات پاشان لەشوێنێکدا (لەسێبەرێکدا) لادەداتو نەختێك دەخەوێتن پاشان خەبەری دەبێتەوە سەیردەکات کە(حوشتر)ەکەی نەماوە کەهەموو خواردنو خواردەمەنیەکیشی لەسەر بووە، پاشان هەڵدەستێت بەگەڕان بەدوای‌دا، هەتا وای لێدێت زۆری تینودەبێتو هیلاك دەبێت هەر نایدۆزێتەوە، پاشان بەخۆی دەڵێت بابگەڕێمەوە شوێنی خۆمو بنوم هەتا ئەمرم!!؛ دەچێتەوە شوێنەکەی خۆیو دەنوێ پاش تۆزێك هەڵدەستێت دەبینێ واحوشترەکەی لەبەردەمیدایە بەخواردنو خواردەمەنیەکەی سەریەوە، ئەوەندە خۆشحاڵ دەبێت لەزۆر خۆشی‌دا دەڵێت: ((اللهم انت عبدي وانا ربك)) واتە: ئەی خوایە تۆ بەندەی منیو من پەروەردگاری تۆم، لەزۆر خۆشیدا ئەم هەلەیە دەکات، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: خوای گەورە لەم بەندەیە خۆشحاڵ ترە بەگەڕانەوەی بەندەکەی بۆ لای.!!!

بەڵێ... ئەمەیە گەورەترین مژدەیەك بۆ تۆی موسڵمان ئەوەیە ئەو دەوڵەمەندیەی کەبێ کۆتایو بێئەزیەتە، ئەوەیە ئەو خۆشحاڵیەی کەهەموو نەهامەتیەکانی دوونیا کۆتایی پێ‌نایەت، دەی هەتازووە بائەم هەموو شتە بەنرخانە بەگەڕانەوە یەك لەگوناهەکان بەدەست بهێنین، باخۆشەویستی خاوەن خۆشەویستیەکان بۆ خۆمان بەدیهێنین (إن شاء الله).

(٢) بانگ خوازان بەتایبەتی: ... ئەم ڕەوشتە بەرزە چەندە بۆ موسڵمانان بە گشتی پێویست بووە ئەوا چەندجاری ئەمە بۆ بانگ خوازان پێویستە، بەشێوەیەك کەبەرامبەر ناکرێت بۆ ئەوانەی کەبون بەچرای تاریکیەکان، بۆ ئەوانەی کەبوون

بەڕزگارکەری خنکاوەکان، بۆ ئەوانەی کەوەك زەوی بەوەفان، وەردەگرت پاشان دەیپارێزێت ئینجا دەیدەنەوەو پێشکەشی دەکەن، لەبەرئەوەی ئەمانە کارەکەیان ئێجگار گرنگە ئێجگار بەرهەمدارە، زۆر گەورەیە، گەورەیەکەی لەوەدا دەردەکەوێت کەبوامبەرەکەی (بەهەشت)ە پێویستی بەپشتیوان هەیە چونکە دوژمنداری زۆرە، پێویستی بەتوانایە چونکە بێهێزەکەری زۆرە.

لەبەرئەوەیە کەهەموو پێغەمبەران (عليهم السلام)، هەردەم پێویستیان بەم پاڕاندنەوە بەکول هەبووە، هەردەم خەریکی داواکردنی لێخۆش بوون بون لەخوای گەورە، هەردەم لەوەختە ناهەموارەکاندا پەنایان بردوە بۆ ئەو زاتەی کەپەنای کەم دەستانە ئەوەتا لەهەموو چیرۆکەکانی قورئاندا ئەم دیاردەیە بەدیدەکرێت، بەتایبەتی لەوەختە زۆر ناهەموارەکاندا هەروەك چۆن ئیبراهیم (عليه السلام) هاواری پەروەردگاری دەکات لەناو ئەو ئاگرەدا کەفرێی دەدەنە ناوی، هەروەك چۆن (ايوب) (عليه السلام) داوای چاك بونەوە دەکات لەپەروەردگاری، هەروەك چۆن (یونس) (عليه السلام) بەکول ئەم داوایە دەکات لەناو سکی نەهەنگەکەدا، هەروەك چۆن (موسى)(عليه السلام) ئەم داوایە دەکات لەکاتێکدا کەخوای گەورە بۆ فیرعەونی ڕەوانە دەکات، هەروەك چۆن (عیسى) (عليه السلام) لەچەرمە سەرییەکانی بانگخوازیدا پەنای بۆ دەبات، جوانترین‌و بەرزترین نمونەش پێغەمبەری ئازیزمان (صلى الله عليه وسلم) لەکاتێکدا کەهەول دەدات بنکەیەکی تازە بدۆزێتەوە بۆ دینی خوای ڕوودەکاتە شاری (طائیف) کەزۆر بەشێوەیەکی ناشرین وەلامی دەدەنەوە، تاریکیەکان دەچن بەگژیا هەول دەدەن بەبەرد چراکان بشکێنن بەلێ... بەبەرد باران کردن ڕاوی دەنێن‌و قاچی موبارەکی پڕدەبێت لەخوێن ئەو قاچانەی کە(ئیسراو میعراج)ی بینی ئەو جەستەیەی کەخوای گەورە پێی دەفەرموێت: ﴿وانك لعلى خلق عظيم﴾

واتە:بەڕاستی تۆ لەسەر خوڕەوشتێکی بەرزی، ئەو ئازیزەی کەخوای گەورە باس لەبەزەیی دەکات بۆ موسولمانان، بەوشێوە ناشرینە وەلامی دەدرێتەوەو پەیڕەوە خوایەکەی وەردەگرێت لەبەرئەوە زۆر بێدەسەلاتی لەخۆیدا بەدی دەکات، سەیردەکات پالپشتەکانی کەس نین ووزەی لێبڕاوە، هەناسەی سەر زەوی سیەکانی پڕناکات لەبەرئەوە بەڕوی دەست بەرزدەکاتەوە بۆ بارەگای خوایی‌و داوای بەزەیی خوای دەکات (اواه)ی خۆی دەنوێنێ‌و ئەم پاڕانەوە شیرینە دەفەرموێت: ((اللهم اليك اشكو ضعفي قوتي، وقلت حيلتي وهواني على الناس ياارحم الراحمين، انت رب المستضعفين، وانت ربي، الى من تكلني؟ الى بعيد يتجهمني؟ ام الى عدو ملكة امري؟؛ انك لم يكن بك علي بغضب فلا

ابالى، ولكن عافيتك هى اوسع لى اعوذ بنور وجهك الذي اشرقت له الظلمات وصلح عليه امر لدينا والاخرة، من ان تنزل بى غضب، او يحل علي سخطك، لك العتبي حتى ترضى، ولا حول ولاقوة الابك)).[1]

واتە: ـ ئەی پەروەردگارە بۆ لای تۆ نالەو نرکەی بێدەسەڵاتیم بەرزدەکەمەوە، بۆ لای تۆبێ تەکبیری‌و کەم دەسەڵاتیم بەسەر خەڵکیدا ئەنێرم، ئەی بەسۆزترین بەزەیدارەکان، بۆ لای کێ دەمنێری بۆلای کەسێکی دورکە ئەم کارەم پێبکات؟ یان بۆ لای نزیکێك (قوڕەیش) کەدوژمنداروەو کاری منی بەدەستە؟

ئەگەر بێت‌و نێگەرانی تۆم بەسەردا نەهاتبێ هەموو ئەمانە بەلای منەوە شتانێك نین، سۆزو میهرەبانی تۆ بەرفراواترە بۆ من، پەنا ئەگرم بەرۆشنای زاتت کەتاریکیەکانی بۆ هەڵهاتون، وەچاکی‌و چاك گوزەرانی جیهان‌و دوارۆژی لەسەربەندە، لەوەی کەخەشم‌ونیگەرانی تۆم بەسەردا بێت، یاخود نیگەرانی‌و قینت بۆم شیاوبێت، بۆتۆ ئەی پەروەردگارا هیلاکی‌و ماندوێتی چێشتن هەتا ڕەزامەندیت بەدەست دەهێنم، وەهیچ تواناو گۆڕانێك نیە لەهیچ کارێکدا تەنها بەیارمەتی زاتی تۆ نەبێت.

بەڵێ.. ئەمەیە (اواه)ی، ئەمەیە ئەو گەیەنەرەی کەتواناکان زیاد دەکاتەوە، ئەمەیە ئەو سەرچاوە سازگارەی کەتینوی بیابانەکان پەنای بۆدەبەن، بانگ خواز ئەمەیە کۆڵەکەکەی کەبڕبڕەی پشتە ماندوەکەی ڕادەگرێت، فێنکی دەدات بەدڵە گەرمەکەی، ڕۆشنی دەدات بەبەردەمە تاریکەکەی.

ئەی بانگ خوازی ئازیز ئەی ئەوانەی ڕاسپاردەیەکتان هەڵگرتوە کەشاخە بەردینەکان پێیان هەڵنەگیرا، ئەمەیە سەرچاوەکان ئەم پاڕاندنەوەو ناڵانەوەو گەڕاندنەوەیەیە ڕۆشنی بیرمان، ئەگەر بێتو ئەم پەیوەندیە توندە نەبێ ئەوا هەرگیز ئەم کارە بەمرۆڤە ئاساییەکان ناکرێ، ئەگەر ڕۆژ نەبێت ئەوا هەرگیز تاریکیەکانی زەوی بەمۆمەکان ڕوناك نابنەوە.

لەبەرئەوە پێویسترین شتێك بۆ بانگ خوازان بریتیە لەپەنابردنی‌و داواکردنی یارمەتی لەزاتی پەروەردگارو توندوتۆڵ کردنی ئەو پەیوەندیەی نێوانیان، بەڵکو بەو پەنابردنە(ئینشاالله) ببنە ڕێنیشاندەری ڕاستەقینەی ڕێگەی خوای بەخەڵکی.

(٦) زوو گەڕاندنەوە بۆ سەرپەیڕەو پڕۆگرامی خوایی یەکێکە لەبەرهەمەکانی مرۆڤی خاوەن ژیری، هەر بەم ژیریە تەواوە بوو کەئیبراهیم هەوڵی دەدا کەبگەڕێت بەدوای

---

(١) السيرة النبوية ـ لابن هشام (ص: ٦٨) ج٢/ الطبعة المغرجة ١٩٩٦.

ڕێگەیەکدا گەڕانەوەی بۆ لای پەروەردگاری پێشان بدات هەروەك خوای گەورە پیٚی دەڵێت: ﴿منیب﴾[1] ئینجا گەڕاندنەوە بۆلای پەروەردگار دەبێت بریتی بێت لەگەڕاندنەوە بۆلای پەیڕەوەکەی بریتیبێت لەتاك هەڵبژاردنی بەرنامەی خوای لەهەموو هەڵسوکەوتێکدا چونکە کاتێك ئیبراهیم علیه السلام خوای خۆی دۆزیەوەو گەڕایەوە بۆلای فەرمووی: ـ

﴿ان صلاتي ونسكي ومحياي ومماتي لله رب العالمين لاشريك له﴾.

واتە: ـ هەموو هەڵسوکەوتو نوێژو پەرستشو مردنو زیندوبونەوەیەکم تەنها بۆ خوای جیهانە بەبیٚ هاوەڵ مانای بێجگە لەوزاتە کەسێکی ترنیە کەمن بەڕێپێشاندەری خۆمی بزانمو بەقسەی بکەمو هەوڵی بۆ بدەم..

(٧) کاتێك باسمان کرد لەم چیرۆکە پاش کەسایەتی ئیبراهیم (علیه السلام) باسمان کردلە (عقیدە) باوەڕیانو پەیڕەو پرگرامیان واتە کردمان بەدووەم باسی چیرۆکەکە، ئەمەش خۆی لەخۆیدا بیٚهودە نیە بەڵکو لەبەرئەوە ئەو باسەمان کردبە گرنگترین باسێك لەدوای کەسایەتی ئیبراهیم(علیە السلام) چونکە باوەڕ سەرچاوەی هەموو چاكو خراپیەکانە، باوەڕ جێگەی (دڵە) دڵیش پاشای جەستەی مرۆڤە زۆرجار ژێریش ناتوانیٚ بەرەنگاری ببێتەوە ئەگەربێتو ناو ئەم دڵە هەرچی تێدابێت ئەوا هەڵسوکەوتی ئەو مرۆڤە بەوشێوەیە دەبێت بۆ نمونە: ـ

گەربێتو هەموو جەستەی مرۆڤ دابنێیت بەشارێكو دڵیش دابنێیت بەو ئیزگەیەی کەپەخش بکات، ئامێرەکانیش هەرهەمان شت پەخش دەکات، کەواتە دڵی مرۆڤ چی تێدابێت (دەستو دەمو چاو قاچ) ئەوانە پەخش دەکەنەوە ئەمە لەلایەك.

لەلایەکیترەوە شتێکی بەڵگەنەویستە کەهەموو کۆمەڵە ،رۆڤێك لەسەر پارچە زەویەك پێویستیان بەیاسایەك هەیە ژیانیان ببات بەڕێوە، هەموو یاسایەکیش جەستەی مرۆڤەکان پەیڕەوی دەکەن، هەموو پەیڕەوکردنێکیش ڕوونادات لەو جەستەیەدا بۆ ئەو یاسایە هەتا ڕەوشتێك نەبێت فەرمانەکانی ئەو یاسایە جیٚبەجیٚبکات، هیچ کاتێکیش ڕەوشتێکی باش دروست نابێت هەتا (عقیدە) باوەڕێکی زاتی باش نەبێت.

لەبەرئەوە (عقیدە) بریتیە لەو سەرچاوەیەی کەئەگەر لێڵ بوو ئەوا هەموو جۆگەکان ناشرین دەبن،و ئێمەی مرۆڤیش تاچەند باوەڕمان دامەزراوبێت ئەوەندە خاوەنی ڕەوشتین، تاچەند ئەو پەیڕەوە جوان بێت کەباوەڕمان پیٚی هێناوە ئەوا ئەوەندە سەرکەوتو دەبین

---

(١) (منیب) واتە/ ئەو مرۆڤەی کەزوو دەگەڕێتەوە بۆلای پەروەردگاری.

لەهەڵبژاردنی یاساکان بۆ ژیانمان، وەهیچ کام لەپەیڕەوەکانیش نیە بۆ دامەزراندنی ئەم (عقیدە)یە پاك ترو بێگەردترو چڕوپڕتر لەپەیڕەوی خوایی، چونکە بێکەم و کورتی و بێبەشە لەهەموو خوازو داخوازێکی مرۆڤەکان.

(٨) لەڕاڤەکردنی ژیانی کۆمەڵگەی ئیبراهیم (علیە السلام) ئەو ڕاستیە دەرگەوت کەئەم کۆمەڵگەیە (عبادە) پەرستشیان بۆ خوای گەورە نەدەکرد بەڵکو بت و ئەستێرەیەکیان دەپەرست کەئەمەش نەزانی ئەو کۆمەڵگەیەی دەرخست، وەباسمان لەوەکرد کەئەم پەرستنە بۆ هەر شتێکی‌تربێت جگە لەخوای گەورە ئەوا ئەو کەسە شایەنی ئەوە نابێت پێی بووترێت خواپەرست، وەئەم (عبودیە)تە زۆر کەس واتێ‌دەگەن کەتەنها ئەوەیە مرۆڤ کڕنوش بۆ بتێك بەرێت یاخود ئەستێرەکان بپەرستێت!!

بەڵام هەرگیز وانیە ئازیزان. بەڵکو ئەم پەرستشە زۆر قوڵترو گەورەترە لەوەی کەتەنها لەم شێوە تەسکەدا بێتە پێش چاوت، چونکە ئەم پەرستنە ئەو کارەیە کە (مرۆڤ و پەری) دەبێت پێی‌هەڵبستن بەتەنهاو بەدەر لەهەموو کارێکی‌تر، ئەی چۆن دەبێت مانایەکی ئێجگار گەورەی نەبێت. لەبەرئەوە بەپێویستی دەزانین کەخوێنەرە خۆشەویستەکان و هەموو مرۆڤێکی گەڕۆك بەدوای ڕاستیدا لەمانای پیری ئەم پەرستشە (العبادە)یە ئاگاداربکەین لەم خاڵەدا، هەتا بزانین کەچۆن ئەم پەرستشە دەکەین و چۆن پەروەردگارمانی پێ‌ڕازی دەکەین.

العبادەك ـ بۆ چاك زانینی مانا گشتیەکەی ئەم زاراوەیە دەچینە خزمەت زانای پایەبەرزی ئیسلام (ابو الاعلی المودودی) تابزانین پێمان دەڵێت چی لەبارەی ئەم کارەی کەهەمومان بۆی دروست کراوین.

لەم بارەیەوە دەفەرموێت: ـ (الخضوع والتذلل، ای استسلام المرء وإنقياده لاحد غيره انقياداً لا مقاومة معه ولاعدول عنه ولاعصيان له، حتى يستخدمة هو حسب مايرضى وكيف يشاء وعلى ذالك تقول العرب: (طريق معبد) للطريق المهد الوطيء)[1]

واتە: ملکەچی و خۆبەکەم زانی، یاخود خۆبەدەستەوەدانی مرۆڤ و پەیوەست بوون بەیەکێکی ترەوە کەبەهیچ شێوەیەك بەرهەڵستی نەکات و بێ فەرمانی نەنوێنێ بەرامبەری، تائەوزاتەی کەخۆی بۆ بەدەستەوەداوە چۆن بیەوێت بەکاری بهێنێ هەروەك عەرەب دەڵێت ڕێگەیەکی ڕاخراو لەبەردەم خەڵکیدا.

---

(١) مصطلحات الاربعة فى القران/ ابو الاعلى المودودى (ص: ٨٧ ـ ٨٨).

... ئەمەیە مانای پەرستش لەزمانەوانیدا، مانای بەهەموو شێوەیەك هیچ جۆرە بەرهەڵستیەکی نەکات لەفەرمانەکانیدا، ئیتر فەرمانەکان بەگشتی نەك لەنوێژدا بەفەرمانی خوای گەورە بکاتو بەڵام لەدەرەوەی نوێژەکە بەرنامەیەکیتر ژیانی بەڕێوەبەرێت، نەك ڕۆژو بۆ خوای گەورە بگرێت بەڵام داوای ڕۆزی لەکەسێکی تر بکاتو دوای بکەوێت، نەك لەخوای گەورە بپاڕێتەوە کەموسوڵمانانو ئیسلام سەرکەوتوبێت، بەڵام لەناخدا چاوی بەموسڵمانانندا هەڵنەیەت دەبێت ئەم بەندایەتیە (شمول)ی بێت گشتگیربێت هەموو لایەنەکانی ژیانی بەندە بگرێتەوە، هەروەك هاوەڵێك دەفەرموێت: ((پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەموو شتێکی بۆ باس کردوین هەتا فێریکردوین لەشوێنی (دەست بەئاو گەیاندنیشدا) دەڵێین چی)).

وەئەبێت مرۆڤەکان بەگشتیو موسڵمانان بەتایبەتی چاك ئەوە بزانن کەزۆرجار (شیطان) دەبێتە سەرۆکیانو دەبێتە پێشڕەویان، کەئەبێت بەهەموو شێوەیەکو هەموو کات نەهێڵن ئەم دیاردە ڕووبدات.

ئەویش بەوە دروست دەبێت کەمرۆڤ لەکردەوەکانیدا شتانێك هەبێت کەببێتە جێی خۆشحاڵی شەیتان ئیتر هەر کردەوەیەکی خراپو دژبەویستی خوای گەورە بێتن هەروەك لەوتەی (ئیبراهیم) (عليه السلام) دا دەردەکەوێت کەبەباوکی دەڵێت ئەی باوکە پەرستشی شەیتان مەکە ﴿يا ابت لاتعبد الشيطان﴾ (مريم: ٤٤).

ئەم پەرستشەی باوکی ئیبراهیم تەنها ئەوەنەبوو کەکرنوش بێت، بەڵکو بریتیبوو لەهەڵسوکەوت کردن بەجۆرێك کەبەپێچەوانەی خواستی خوای گەورە بوو.

کەواتە ئیماندار... ئەبێت چاك ئەوە بچەسپێت لەبیروبۆچونیدا کەهەموو کردەوەیەك خوای گەورە پێی خۆش بوو ئەوا پەرستش دەژمێرێ بۆت لای خوای گەورەو هەرهەڵسوکەوتێکیش کەخوای گەورە نەیەوێت ئەوا بەگوێڕایەڵی یەکێکیتر دادەنرێت نەك خوا.

(٩) بیرکردنەوەو تێڕامان ئەو دیاردەیە کەمرۆڤەکان واڵیدەکات کەشایستەی بەندەیی خوابن.

بەڵێ.. هەر بیرکدنەوەو تێڕامان بوو وای لەئیبراهیم (عليه السلام) کرد کەبۆی ڕون بێتەوە کەئەم دیاردەیەی گەلەکەی پێوەی خەریکن کارێکی بێ‌مانایەو دەبێت ئەم بوونەوەرە دروست کەرێکی هەبێت.

چەند گەورەیە ئەم بیرکردنەوەیە، گەورەیەکەی لەوەدا دەردەکەوێت کە بەرەکەی بریتییە لەدۆزینەوەی (خوا)، نرخەکەی لەوەدا دەردەکەوێت دڵی پێ‌خۆش دەبێت، ئەو

دڵخۆشیەی کەهەموو هەڵسوکەوت و هەوڵدانێکی لەپێناودا بەخت دەکات، ئەو دڵخۆشیەی کەتەنها بەیادی خوای گەورە دێتە دەست هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: ئایا هەریەیادی خوا دڵەکان ئارامگری و خۆشحاڵی بۆ دروست بێ؟

﴿الا بذكر الله تطمئن القلوب﴾ ئینجا ئەم بیرکردنەوەیە یەکێکە لەو دیاردانەی کەدەبێت هەرگیز لەئیماندار جیانەبێت، بەڵکو قورئانی پیرۆز لەچەندەها شوێندا ئەم دەستەواژە دووبارە دەکاتەوە کەدەفەرموێت: ﴿لعلكم تتفكرون، لعلكم تعقلون، افلا يتبرون، او لايعلمون﴾ ئایا بیرناکەنەوە، باشترینیان ئەوانەن کەبیردەکەنەوە .... هتد.

بەڵام مەخابن موسڵمانان ئەم داوا خواییەیان لەیادکرد ئەویش بووەهۆی ئەوەی کەئێستا باری گوزەرانیان چەندە لەدواوەیە، چەندەبوون بەژێردەستەی خەڵکی چەندە نەفامی لەبیروبۆچونیاندا بەدی دەکرێت چەندە بێتوانان لەلایەنەکانی ژیانیان.

ئەمانە هەمووی بریتیە لەو گەلاَ وشکانەی کەبەدارێکی بێڕەگەوەن، ڕەگی داری موسڵمان بریتیە لەبیرکردنەوە، ئیتر لەهەرلایەنێکی باشەدابێت، مەرج نیە تەنها بیر لەنوێژەکانی بکاتەوە، مەرج نیە تەنها بیرلەوە بکاتەوە کەچەند فەرمودە لەبەریکات، چەند قورئان لەبەریکات بەڵکو بیکردنەوە لەزانیاریەك کەخزمەتی قورئان و فەرمودە بکات هەروەك یەکن دۆزینەوەی بیرۆکەیەك کەخزمەتی بیری ئیمانداران بکات هەر بیرکونەوەی خێرە، دۆزینەوەو بیرکردنەوە لەپرۆژەیەك کەخزمەتی ئابوری موسڵمانان هەر خێرە، بیرکردنەوە بۆ تازەکردنەوەی ئیسلام و گەیاندنی بەپێی ئەو سەردەمە هەرکارێکی خێرە لەبیرکردنەوەدا.

کەواتە بیرکردنەوە لەهەموو لایەنێك کەنەك خزمەت بەموسڵمانان بەڵکو بەخەڵکیش بەگشتی بگەیەنێ هەرخێرە، بەتایبەتی ئەو ڕۆژەی موسڵمانان زۆر پێویستیان بەم بیرکردنەوەیە هەیە، پێویستە هەوڵی بۆ بدەین، خەمخۆری‌بین، ئیتر هەرکەس و لەتوانای خۆیداو لەولایە نەدا کەبۆی دەڕەخسێ و حەزی لێدەکات.

هەرکاتێك ئەم بۆچونەمان هەبوو ئەوا دڵنیابن کەهیچ نەبێت دەتوانین ئیسلامی ڕاستی لەخۆمان‌چوار دەورمان‌بگەینین.

(١٠) لەهەموو سەردەم و هەموو شوێنێکدا ئەبێت مرۆڤ خاوەنی ئەو تێگەیشتنەبێت کامل بۆ ڕاستی کەچ بکات، بەڵکو دەبێت ئەگەر نزیکترین کەسانێکیش ببینین لەناڕاستیدا ئەوا ئاگاداریان بکات دوور لەگیانی بیرووشکی، ئەوەتا ئیبراهیم (علیه السلام) چونکە تەنها ئەوەی بۆ دەرکەوتووە کەئەم بوونەوەرە دروست کەرێکی هەیەو

ڕاستی دۆزیوەتەوە، ئیتر ملی بۆکەچ دەکات، بەرامبەر ئەوەش بەڕەنگاری هەموو کۆمەڵگەکەی دەبێتەوە، چونکە دەبینێت باوکیو خەڵکیش لەناڕاستیو نەفامیدا نوقم بوون.

موسڵمان ئەبێت ئەمە پیشەی بێت بەتایبەتی وەخەڵکیش بەگشتی چونکە هەرکەس سەری بۆ ڕاستی دانەنەواند ئەوا لەسەر کورسی چەوتی دانیشتوەو هەستو نەستی مرۆڤی تێدا زۆرکەمە، بەڵکو هەرنیەتی بۆ ئەوانەش کەهەردەم ڕاستیو دروستی ئیسلام هەست پێدەکەن، بەڵام ملی بۆکەچ ناکەن، مل بەرزی لەئاستدا دەنوێنن.

کەبەڕاستی ئەم دیاردەیە لەهەرکەسێکدا هەبێت ئەوا دەبێتە میکرۆبێکی کوشندە بۆخۆیو چواردەوریشی، دەبێتە ئەو خۆرەیەی کەهەردەم مرۆڤایەتی بەرەو داماوی دەبات، چونکە هەموو خۆشگوزاریەکانی ژیانی مرۆڤایەتی بەمل کەچ کردن بۆ ڕاستی (واقیع) هاتۆتەدی، هەرگیز بەلاری خەڵکان نەبووە، ئەوا مێژوو شاهێدی ئەو ڕاستییە، هەرکاتو هەر وولاتێك لەمێژوودا خەڵکانێکی مل کەچ کەر بۆ ڕاستیەکان بەڕێوەبەری بوون ئەوا مرۆڤایەتی خۆشحاڵی بەخۆیەوە بینیوە باشترینو جوانترین نموونەش بۆ ئەم ڕاستیە ئەوە (سەردەمی یوسف علیه السلام، سەردەمی پێغەمبەر (محمد) (ﷺ) کەهەردووکیان دووسەردەم بوون کەمێژوو لەوەسفیاندایە.

# بەندی دووەم

## گەڕان بەدوای پەروەردگاری ڕاستەقینەدا

بەڵێ... باسمان لەفطرەتی ئیبراهیم کرد کەچۆن نوقمی بیرکردنەوەی کردبوو چۆن سەرگەردان بوو لەحاڵێ قەومەکەی چەند تامەزرۆبوو بۆ دۆزینەوەی پەروەردگاری ڕاستەقینەی خۆی.

پاش ئەوەی کەبەباوکی فەرموو: ئەم بتانە هیچ سودو زەرەرێکیان نیەو ئەمەی ئێوە دەیکەن بریتیە لەگومڕایەکی گەورە، هاتە سەرئەوەی ئەی ئەو خوایە کێیە کەخەڵکی بیپەرستێ بەتەنها، ئەو بەدیهێنەرە کێیە کەسوپاس گوزاربکرێت؟ ئەو بەبەزەییە کێیە کەداوای لێخۆش بوونی لێبکرێت؟

هەردەم بیری دەکردەوە ئەبێ ئەو زاتە کێبێت؟ چۆن بیدۆزێتەوە؟ لەکوێبێت؟ ئەی چیبکەم بۆ دۆزینەوەی باشە؟

لەبەرئەم پرسیارانەدا بیری لەوەکردەوە کەکۆمەڵگەکەی ئەستێرەش دەپەرستن، ئایا بڵێی ئەم پەرستنەی ئەوان ڕاست نەبێ؟ خۆلەوانەشە ئەمانەش هەر لەگومڕایدا بژین وەك بت پەرستەکان؟

دوای ئەم پرسیارانەی کەلەخۆی دەکرد هەستا بۆ تێکۆشانێکی ڕاستگۆیانە بۆ دۆزینەوەی پەروەردگاری، ئەویش بەلەتەرازوداني (ئەستێرەو مانگو ڕۆژ) کەئیتر لەسەرو هەموو شتەکانەوە بوونو لەهەموو شتەکان گەشاوەتربونو جوان تربوونو هەتا زۆریەی بتەکان لەسەر ناوی ئەم ئەستێرانە ناونرابوون.

بەڵێ... قورئانی پیرۆز زۆر بەشێوەیەکی جوانو سەرنج ڕاکێش وێنەی ئەم هەستە پاكو بێگەردە، ئەم هەستە گەشتیارە بەدوای خوای خۆیدا دەکێشێت کەدەفەرموێت:

﴿وكذالك نرى ابراهيم ملكوت السموات والارض وليكون من الموقنين* فلما رأى كوكبا قال هذا ربي، فلما افل قال لااحب الآفلين* فلما راى القمر بازغا قال هذا ربي،فلما افل قال لأن لم يهدني ربي لاكونن من القوم الضالين فلما راى الشمس بازغة قال هذا ربي هذا اكبر فلما افلت قال ياقوم إني بريء مما تشركون* اني وجهت وجهي للذى فطر السماوات والأرض حنيفا، وما انا من المشركين﴾ (الانعام: ٧٥ - ٧٩).

واتە: هەروەك چۆن بۆ ئیبراهیممان دەرخست کەکۆمەڵگەکەی لەسەر گومڕایـن ئـەویش بەهەستی (فیطرة) هەر ئاوەهاش تەختو مولکی زەوی‌و ئاسمانەکانمان پیشان دا بۆئـەوەی دڵنیـابێت لـەخاوەنداریّتی تـاكو تەنـهایی ئـەم گەردونـە لـەلای خـوای گـەورە ـ کـاتێك ئەستێرەیەکی بینی ووتی: ئەمە خوای منە، بـەلأم کـاتێك ئـاوابوو ووتـی مـن خوایـەکم نـاویّ کەون ببیّو هەرگیز خوای وام خۆش ناویّ وەکاتێك مانگی بینـی هەڵهاتوو ڕۆشـن [1] ووتـی: ئەمە خوای منە بەلأم کاتێك دیارنەما ووتی –ئیبراهیم– ئەگـەر پـەروەردگارم ڕێنیشـاندەرم نەبیّو یارمەتیدەرم نـەبیّ ئـەوا منیـش دەبم بەیـەکیّ لەکۆمـەڵی سەرلێشیّواوانو گومڕایـان، پاشان ڕۆژی بینی بەهەڵهاتوی‌و پرشنگداری ووتی: ئەمەیە خوای‌من ئەمـە گـەورەترە، بـەلأم کاتێك ئەمیش ئاوابوو ئەما وتـی: ئـەی گەلەکـەم مـن بـەدورمو بیّبـەریم لـەهاوەڵ قـەراردانی ئێوە ئەوا من ڕووم کردە ئەو زاتەی کەزەوی‌و ئاسمانـەکانی دروسـت کـردوەو بـەدیهێناوە، بەپاکژی‌و هەرگیز من لەهاوەڵ قەرارداران نیم.

... ئەمەیە ڕاستگۆترین بیرکردنەوە، ئەمەیە پیرۆزترین گەران پیرۆزی‌و گەورەیەکـەی لەوەدا دەردەکەوێت کەبدۆزەکە بریتی‌یە لـەخوای گـەورە بەدیهێنـەری شـتەکان ڕۆزی دەری زیندوەکان، بەدیهێنەری ئاسمانەکان، ئەو زاتـەی کەتەنـها چرکەیـەك غـافڵ نیـە لەبـەندەکان ئەو زاتەی کەئیبراهیم (علیه السلام) وێڵ بوو بەدوایدا.

ئەمەیە ڕاستگۆی لەبینین‌و بۆچوندا، ئەمەیە ڕاستگۆی لـەبینین‌و هـەڵبژاردندا، مـەخابن لـەم سـەردەمەی ئێسـتادا هـەموو شـتەکان هـەموو بەرنامـەکان خـواری‌و ناڕاسـتیان دەردەکـەوێتو خـەڵکیش دەبینـن بـەچاوی سـەریان، بـەلأم بیـری لێناکەنـەوە، نـاتوانن دەریبڕنو بەخۆیان بسـەلمێنن کەناڕاسـتە، زۆر بەپێچەوانـەی ئیبراهیمـەوە کەهـەر یەکسـەر لەبیروبۆچونیدا دروسـتی‌و نادروسـتی شـتەکانی دەسـەلماند کـەچی ئـەمڕۆ زۆر بەئاشـکرا ڕاستی‌و ناپاکی بەرنامەکانی تریش زەق‌و ئاشـکرایە بـەلأم خـەڵکی چـاوی دڵیـان کوێربـووەو تەنها بەچاوی سەر دەبینن.

زانای پایەبەرزی شەهیدی ئیسلام (سیدقطب) لەم ڕاڤەی ئـەم ئایەتـەدا دەفـەرموێت: ـ (وهذا هو طريق الفطرة البديهي العميق..وعى لايطمسة الركام. وبصر يلخص مـافي الكون مـن عجائب صنع الله وتدبر يتبع المشاهد حتى تنطق لـه بسرها المكنـون.. وهدايـه مـن الله جـزاء على الجهاد فيه).[2]

---

(١) مفردات الفاضي القران/ راغب الأصفهان/ الطبعة المحققة

(٢) في ضلال القرآن ج/٣/(ص: ٢٩١)– بيروت لبنان.

واتە: ـ ئائەوەیە ڕێگەی ڕاستی فیطرەت، فیطرەتێکی قوڵ، ئەمە ئاگاداری و بەئاگاییەکە، کەتۆزوپیسی دایناپۆشێ و بینایییەکە کەووردی و سەرسوڕهێنەری دەستکردی خوا بەدی دەکات، بیرکردنەوەو دواکەوتنێکی وێنەکان تاوای لێدێ (واتە وێنەکان، مەشهەدەکان) هەرچییەك لەسەیروو گەورەیە شاراوەکان هەیە باسی دەکات، و لەبەرامبەری ئەم جۆرە بیرکردنەوانە، ڕێی پیشاندەری خواییە لەپاداشتی تێکۆشان بۆی واتە: ئەو تێکۆشانەی کەبریتی بوو لەگەڕان بەدوای پەروەردگاریدا.

بەڵێ... ئەم پێغەمبەرە ئازیزە ئاوەها هەوڵی دۆزینەوەی بەدیهێنەرەکەی داوە ئەم هەوڵەش خەلاتێکی خواییە بۆ ئیبراهیم و پێگەیاندنی بوو، بەڵکو دروست کردنی کەسایەتی ئیبراهیم بوو بۆ ئەوەی بێتە ڕێنیشاندەری ڕاستەقینەی مرۆڤەکانی سەر زەوی، کارەکەی زۆر گران بوو بۆیە پێویستی بەیارمەتی خوای هەبوو بۆگەڕان بەدوای ئەم پەروەردگارەداو دوایش ناساندنی بەخەڵکی، لەبەرئەوە خوای گەورە باس لەویارمەتییە خواییە دەکات و دەفەرموێت: ـ ﴿ولقد آتينا ابراهيم رشده من قبل وكنا به عالمين﴾ (الانبياء: ٥١).

زانای بەرزی ئیسلام (ابن كثير) لەڕاڤەی ئەم فەرمودەیەدا دەفەرموێت: ـ (انه اتاه رشده من قبل، اى من صغره الهمه والحق والحجه على قومه)[1]

واتە: پەروەردگار ووریای و دانای و زانای لەپێشدا پێبەخشیبوو، واتە بەمنداڵی هەستی ڕاستی و بەڵگەداری لەسەر گەلەکەی پێبەخشیبوو.

ئەمەیە ئەو مرۆڤەی کەخوای گەورە دەینێرێت تاریکی هەموو دڵەکان ڕامالێ. ئەوەیە ئەو سەردارەی کەدەبێتە مانگە شەوی تاریکەکان، ئەمەیە ئەو سەرچاوەیەی کەسەرلەنوێ خونچەکان زیندو دەکاتەوە بەئاوی سازگاری، ئەمەیە ئەو زاتەی کەلەم وەختو کاتەوە ئیتر هەڵدەستێت بەکاری پێغەمبەرایەتی خۆی و بانگ کردنی خەڵکی بۆ ناساندنی ئەو خوا تاك و تەنهایە پێیان...

## ئیبراهیم و کاری بانگ خوازی لەکۆمەڵگەکەیدا

... پاش ئەوەی کەئیبراهیم (عليه السلام) یەکلایی خۆیی دەربڕی بۆ دروست کەری زەوی و ئاسمانەکان، و بۆی دەرکەوت کەئەم شتانەی گەلەکەی دەیپەرست هیچیان شایەنی ئەوەنین کەکرنوشیان بۆ ببرێت و بەخوابزانرێت پاشان دەستی کرد بەگەیاندن و بڵاوکردنەوەی ئەم بۆچونە خواییەو گەیاندنی تۆوی یەکتاپەرستی بۆ کێلگەی دڵەکان، هەروەك چۆن باخەوانەکان هەموو ئاواتێکیان خزمەت کردنی زەوییەکانەو پڕبوونەوەیەتی

(١) تفسير القرآن العظيم/ ابن كثير/ ج ٣ (ص: ١٧٣)/ دار اليوسف/صفحه

بەتووی بەسود. وەیەکەم کەسێك کەهەوڵی لەگەڵ دا باوکیبوو، ئەوەبوو پێش ئەوەی بەتەواوەتییش خوای خۆی بناسێ هەر فیطرەت وای لێکردبوو جارویار بەرهەڵستی باوکیو گەلەکەی دەکرد هەروەك لەپێشدا باسمان کرد، بەلاّم ئەم جارەیان جیاوازە، چونکە ئەمجارەیان ڕێی ڕۆشنی پەروەردگاری ناسیوەو بەئازایەتییەکیترەو بەرهەڵستییان دەکات.

ـ ئەم بەرهەڵستییەی ئیبراهیم (عليه السلام) بۆ باوکیو پاشان گەلەکەی، لەقورئانی پیرۆزدا لەچەند شوێنێکدا باسی لێوەکراوە کەهەوڵ دەدەین بەپشتیوانی خوای گەورە بۆ خوێنەری بەڕێزی ڕوون بکەینەوە،

خوای گەورە لەسورەی (الصافات)دا باسی لەم هەڵوێستە دەکاتو دەفەرموێت: ﴿وان من شيعته لابراهيم * اذجاء به قلب سليم * اذقال لأبه وقومه ماذا تعبدون* الفكا الهة دون الله تريدون* فما ظنكم برب العالمين﴾ (الصافات: ٨٣ ـ ٨٧)

واتە: وەلەوانەی لەسەر ڕێگەی (نوح) بوون بەپاكوبێگەردی لەڕێگەی تەنها خوای گەورە، بریتییە لە(ئیبراهیم)(عليه السلام)، کاتێك ڕووی‌کردە خوای گەورە بەدڵێکی پڕ لەیەکتاپەرستیو دوور لەهاوەڵ قەراردانەوە ڕووی کردە باوکیو گەلەکەیو پێیوتن ئەوەچی دەپەرستن؟

ئایا درۆیەکی ئاوەها گەورەو دیار لەگەڵ خۆتاندا دەکەنو جگە لەخوای گەورە دەپەرستن، بەڕاستی ئەمەی ئێوە دەیکەن گومڕایەکی گەورەیە.

ئەی ئایا ئێوە دەڵێنچیو چۆن تێدەگەن لەپەروەردگاری جیهان.

هەروەها لەسورەی (الشعراء)دا خوای گەورە بۆمان باس دەکاتو دەفەرموێت: ﴿واتل عليم نبأ ابراهيم* اذ قال لأبيه وقومه ماتعبدون* قالوا نعبد اصناما فنظل لها عاكفين* قال هل يسمعونكم اذتدعون* او ينفعونكم او يضرون* قالو بل وجدنا ابائنا كذالك يفعلون* قال افرأيتم كنتم تعبدون* انتم واباتكم الأقدمون* فانهم عدولي الا رب العالمين﴾ (الشعراء: ٦٩ ـ ٧٧)

واتە: ـ ئەی محمد (عليه الصلاة والسلام) بۆیان باسبکە چیرۆكو بەسەرهاتی (ئیبراهیم) (عليه السلام) کاتێك کەبەباوکیو گەلەکەی ووت چی دەپەرستن؟ وەلاّمیان دایەوە کە: ئێمە بتو بەردەکان دەپەرستینو بەردەوامیش دەبین لەسەر ئەم جۆرە پەرستنەو گەورەییان دەردەخەین، لێرەدا ئیبراهیم بۆئەوەی بۆیان ڕوون بکاتەوە کەئەم پەرستنەیان بێهودەیە فەرمووی: ـ ئایا ئەوانە گوێیان لەدەنگو داواکاریەکانتانەو وەلاّمتان دەدەنەوە کەبانگیان دەکەن؟

ئایا خێرو باشەو چاکی‌تان پێ‌دەگەیەنن کەبەقسەیان بکەن، یاخود زەرەرو خراپی‌تان پێ‌دەگەیەنن ئەگەر بەقسەیان نەکەن؟ مانای هیچ زەرەرو قازانجێکتان پێ‌ناگەیەنن وادەیان پەرستن‌و کردووتانن بەخوای خۆتان؟ لەوەلآمدا گەلەکەی وتیان: ـ ئێمە ئەوانەی تۆ دەڵێیت گرنگ نیە لامان، بەڵکو ئێمە باوباپیرانمان دۆزیەوەتەوە کەلەسەر ئەم پەیڕەو پرۆگرامەبوون،و ئەمەکاری ئەوان بووە بۆیە ئێمەش ئەم کارە دەکەن.

(ئیبراهیم)یش بۆ ئەوەی کەهەست‌و هۆشیان بجوڵێنێ زیاتر پێی ووتن ئایا ئەمانەی ئێوە دەیپەرستن بیرتان لێکردونەتەوەو لەسەر ئەقڵەوە هەڵتان بژاردون، واتە ئەمانەی ئێوە دەیپەرستن بەهەموو بیرکردنەوەیەك وەبەهەموو تێگەیشتنێك ئەم پەرستشەی بۆ ئەکەن؟ ئێوەو باوباپیرانی پێشوتان هیچ بیرکدنەوەیەك تان کرد کەشایەنی ئەم پەرستنەن، یان نا؟ لەبەرئەمانە من پێتان دەڵێم ئەمانە هەمووی دووژمنی منن‌و هیچ کامیان هەڵنابژێرم تەنها پەروەردگاری جیهانیان نەبێ.

... ئەوەیە بەڵگەکانی بانگ خوازی خوایی، ئەمەی ئەو خونچەیەی کەدەیەوێت لەبنکی دڕکەکانداو لەجێی دڕکەکاندا لەوتووە بڕوێت کەبۆن خۆشی‌و جوانی دەبەخشێت بەچواردەور، بەهەموو جۆرەکانی بەڵگە، بەهەموو ئەو بۆچونانەی کەژیری مرۆڤ پەسەندی دەکات، هۆش‌و بیرەکان پێی ڕازی دەبن‌و بینین‌و بیستن بۆی تامەزرۆن.

جوانترین نمونەی بانگ خوازی‌و بەرزترین باوەڕ، کەهەموو هێزەکانی بەرامبەر دەروژێنێت‌و هەموو ویژدانەکان دەخاتەوەگەڕ، هەوڵی خستنەکاری جوانترین خەڵاتی خوای دەدات کەمرۆڤایەتی گەیاندوە بەم پێشکەوتوو خوازیەی ئێستا، کەواتە ئەگەر هاتو ئەم خەڵاتە خوایە لەکاردابوو ئەوا هەردەم خزمەت‌و جوانی‌و جوانکاری پێشکەش خۆی‌و چوار دەوردەکات، بەڵام ئەگەر بێتو ئەم ژیریە لەکارکەوت‌و سەری بۆ ڕاستیەکان کەچ نەکرد ئەوا بێگومان خاوەنکەی‌و چواردەورەکەشی زەرەرمەند دەبن.

بەڵێ... ئیبراهیم (علیه السلام) دەیویست ئەو بەشە بجوڵێنێت لەمرۆڤدا کەسەرۆکی هەموو شۆڕشە ڕزگاریەکانی مرۆڤە لەکۆتەکانی(شیطان)، کەئەمەش باشترین‌و جوانترین نمونەیە بۆ بانگخوازان کەلەکاری بانگ خوازیاندا ئەم جۆرە پەیڕەوە بگرنە بەرو هەوڵی جولاندنی ئەو بەشەی مرۆڤ بدەن کەهەرگیز داوا ناپەسەندو زیادڕەوەکانی ئارەزوی پێ پەیڕەو ناکرێت‌و هەردەم‌و لەهەرکاتێکدا ئەگەر هاتوو جەستەی مرۆڤ پاشاکەی بریتی بێت لە (ژیری) ئەوا سەرکەوتو سەرفرازە.

هەروەها خوای گەورە لەسورەی (الأنبیاء)دا دەفەرموێت: ـ ﴿ولقد اتینـــا ابراهیـــم رشده من قبل وكن به عالمین* اذقال لابیه وقومه ماهذه التمائل التی انتم لها عـــاكفون* قالوا وجدنا اباءنا لها عابدین* قال لقد كنتم واباءكم فی ظلال مین* قالوا أجئتنا بالحق ام انت من الاعبین﴾ (الانبیاء: ٥١ ـ ٥٦)

واتە: خوای گەورە دەفـەرموێت: ئێمـە زانـایو دانـایو سـەركەوتویەمان دا بـەئیبراهیم لەپێشدان واتە بەیارمەتی ئێمە وای لێهات بەرهەڵستی ئەو ناڕەوایانە بكـات،و خۆمـان پـێی زانیـاربووین كەئەمانـەمان پێبەخشـی واتـە بـۆ كـارێكی تایبـەت بـوو، كـاتێك كەبـەباوكیو كۆمەڵگەكەی ووت: ئەم داتاشراوە بتە بێسودانە چین كەئێوە بۆی كڕنوشو زەلیل دەبن؟

گەلەكەی ووتیان: ئێمە باوباپیرانمان لەسەر دۆزیوەتەوەو ئەوان بەندەیان بوون.

ئیبراهیمیش لەوەڵامدا پێیان دەڵێتەوە: بەڕاستی خۆتانو باو باپیرانیشتان لـەگومڕایو سەرلێشێواویەكی گەورەدا بوون.

ووتیان: ـ ئایا تۆ ئەوەی پێمان دەڵێی بەبۆچونی خۆت بەڕاسـتی دەزانـی یـاخود لـەو كەسانەی كەبۆگەمەو خۆشی قسەدەكەیت.

بـەڵێ... ئەمـە ئـەو ئیمانەیـە كەلەشـاخەكان بـەهێزترە، لەئاسمانـەكان بـەرزترە، گەورەیەكەی لەدەریاكان زیاترە، ووتەشی لەهەموو بێژەرەكان ڕاستگۆترە.

تەنها كەسێك چونكە باوەڕداریەكەی لەلوتكەدایە، بـەرەنگاری كۆمەڵگەیـەك دەبێتـەوە تەنها فرمانێك هەموو بیسەرەكان دەهەژێنێت، زۆر گەورەیە، بـەڵكو زۆر گرانـە هـەر بەقسـەو باس كردن ئاسانە، تەنها مرۆڤێك هاواری ڕاسـتی دەكـات لـەناو كۆمەڵگەیـەكدا، بـەبێ تـرس لەمرۆڤـەكان، لەبەرئـەوەی بـاوەڕی وایـە كەپـەروەردگاری لەگەڵیدایـە. هـەردەم وادەبینـێ كەلەشـكری خـوای ئـــەم لاولای گرتـــووە، هـــەردەم واتێدەگـات لـەخۆی كەبریتیـیە لـەو جوتیـارەی كەهەڵدەسـتێت بـەپاك كردنـــەوەی كێڵگـە بەسـودەكان لـەدڕكو داڵو پاشـان هەڵدەستێت بەچاندنی باشترین تۆو تێیدا كەتۆوی یەكتاپەرستیە.

خەڵاتـە... خـەڵاتێكی زۆر گەورەیـە، هـەموو مرۆگـەكان یەكسـان دەكـات بەیەكسـان بوونی پەروەردگاریان، نەكـەس بـەندەی كەسـە، نەكـەس مـافی كـەس دەخـوات، هـەردەمو هەركاتێكیشو لەهەر شوێنێكیشداو هەركەسێكیش خوڕەوشت جوانتربوو، سنور پـارێزتربوو بۆ سنوری خوایی، چاكەكەرتربوو لەگەڵ مرۆڤەكاندا ئەوا لەهەموویان بـەرێزترە لـەلای خـوا، كەسێك بۆی نیە بڵێ سەرگەورەم هەتا خزمەت كەرنەبێ، هەموو خزمەت كـەرێكی دڵسـۆزیش سەرگەورەی مرۆڤەكانە،

ئەمەیە پەیڕەوکە . . . پتەویو بەرزی ئەم پەیڕەوەبوو وای لەئیبراهیم کردبوو کەبێ هیچ گومانێك کاری بانگ خوازی خۆی بەجێبهێنێ، هەوای پاکی ئیمانداری بگەیەنێتە تاساوەکانی ناو ژێر زەمینەکان، تیشکی ڕووناکی خوالی بگەیەنێتە تاریکی دڵەکان.

ئەمەی بانگ خوازی ڕاستیو دڵسۆز، چەندە خەمخۆری باوکیەتی ئەی چەندە گەلەکەی، خۆ ئیبراهیم داوای زێڕو سامان ناکات، تەنها ئەوەنەبێ خێری پێیەن ئەی بۆچی وەڵامی نادرێتەوە، لەبەرئەوەی دڵەکان گوناه داپۆشیوون، تاوانکاری ڕەشیکردون، دوور لەخوای مرانوونی هەروەك بەردێکی ڕەقیان لێهاتووە، ئای چەندە تاوانکاری ڕوودەکاتە ئەو دلانەی کەبانگ خوازی بانگیان لێدەکاتو وەلامی نادەنەوە، بەلکو گوێشی بۆ ناگرن.

ئەمڕۆی گەنجانی ئیماندار. . . بانگ خوازە مامۆستاکان، ئەوانەی ئەم ئاینەیان وەك بیلبیلەی چاویان پاراست تاگەیاندیان بەئێمە، منالە چاو گەشەکانی مزگەوت، ئەمانە هەمووی بانگ خوازی خواین، ئەو گەنجە شیرینانەی کەگوهەری قورئانو فەرمودەی شیرینی پێغەمبەر (ﷺ) دەگەیەنن بەخەلکی. ئەمانە هەمووی خوێنەری ئازیز.. هەلگری ئەو پەیڕەوەن کەخوای خاوەنت، دروست کەرت، بەدیهێنەرت، ڕۆزیدەرت، دایناوە بۆت، دەی هەتا نزیکترین شت کە(مردنە) ڕووی نەداوە، وەلامیان بابدەینەوە لەگەلیاندا ببینە هاوکارو هاوپەیام.

باچیتر ئەو بێئاگایەی کەتوشمان بووە لەخۆمانی داماڵین، باچیتر لەو مرۆڤانە نەبین کەشاعر وەسفیان دەکاتو دەفەرموێت: ـ

والدهر فى صرفة عجيب      ولكن غفلة الناس اعجب

واتە: بەڕاستی کاتو ژیان لەڕۆشتنیدا زۆر سەیرە، بەلام لەوە سەیرتر بریتیە لەبێ ئاگای خەلکی لەو ڕۆیشتنە.

باهەرگیز لەو خەلکە بێئاگایانە نەبین تاڕۆژێ زووتر خۆمان ئامادەی ڕۆژێك بکەین کەکردەوەکان نەبێت ڕەوشتەکان نەبێت، کارە ڕاستگۆکان نەبێت هیچ کام لەمانە خاوەنی ناکەوێت.

هەروەها جارێکیتر خوای گەورە باسی بەشێکیتر لەبانگخوازی ئیبراهیم دەکاتو دەفەرموێت: ـ ﴿واذكر فى الكتاب ابراهيم انه كان صديقا نبيا، اذ قال لابيه ياابت لم تعبد مالايسمع ولايبصر ولايغنى عنك شيئا* ياابتى انى قد جائنى من العلم مالم يأتك فاتبعني اهدك صراطا سويا* ياابت لاتعبد الشيطان إن الشيطن كان للرحمن عصيا* ياابتى انى اخاف ان يمسك عذاب من الرحمن فتكون للشيطام وليا﴾ (مريم: ٤٥)

واتە: یادی بەسەرهاتی پێغەمبەری خودا (ئیبراهیم) (علیه السلام) بکەرەوە لەقورئاندا ئەی محمد(ﷺ) کەبەڕاستی پێغەمبەرێکی[1] ڕاستگۆبوو، کاتێك بەباوکی فەرموو ئەی باوکی شیرینم بۆچی شتانێك دەپەرستی کەهەرگیز نابیستیٚو نابینیٚو هیچ خۆشیو چاکەیەکت پیٚناگەیەنیٚ ئەی باوکی شیرینم من لەلایەن پەروەردگارمەوە زانیاری زانایەتیم پیٚگەیشتووەو خەلاٚت کراوم، کەئەم زانیاریە لەلای تۆنیە(واتە وحی) دەی تۆش بەهۆی ئەم زانیاریەمەوە دوام بکەوە بارێگەیەکی ڕاستت پیشان بدەم، ئەی باوکی شیرینم لەکارو کردەوەتدا پەرستشو بەقسەی شەیتان مەکەو دوای مەکەوە، لەبەئەوەی کە(شیطان) وەختی خۆی یەکێك بووە لەو کەسانەی کەبیٚفەرمانیو بەرهەڵستی فەرمانی خوای گەورەی کرد، ئەی باوکی شیرینم من زۆر دەترسم کەبەهۆی، ئەم جۆرە کارانەتەوە ناخۆشیو سزا لەلایەن خوای بەبەزەیەوە بەتۆ بگات، ئەو کات ببیت بەهاوڵو بەشدار لەگەل شەیتاندا.

ئیمامو زانای پایەبەرزی ئیسلام (فخرالدین الرازی) لەبارەی ڕەفەی ئەم دەقەوە دەفەرمویٚت: (انه(علیه السلام) اورد هذا اكلام الحسن مقرونا باللطف والرفق فان في مقدمه كل كلام (یاابت) دلیل على شده الحب والرغبة في صونه عن العقاب وارشاده الى الصواب وختم الكلام بقوله (انى اخاف) وذالك يدل على شده تعلق قلبه بماصالحه)[2]

واتە ئیبراهیم (علیه السلام) ئەم وتە شیرینانەی لەو شێوە جوانەدا دەردەبڕی کەنەرمونیانی تێدا دەردەکەوێت کەلەسەری هەموو قسەکردنێکدا دیارە کەدەڵێت (ئەی باوکی شیرینم) وەئەمەش ئەوە دەسەلمێنیٚو بەڵگەیە لەسەر زۆر خۆشەویستیو زۆر بەتەنگەوە بوون لەپاراستنی باوکی لەو سزای خوایە،و ڕێنیشاندانی بۆ ڕێگەی ڕاستو ڕەوان وەکۆتایی وتەکانیش بەوتەی (انى اخاف) واتە من زور ئەترسم، هێناوە کەئەمەش بەڵگەی زۆر پەیوەستی دڵی ئیبراهیم دەگەیەنیٚ بەخۆشیو چاك گوزەرانی باوکیەوە.

بەڵیٚ.. خوێنەری ئازیز ئالەم دقە پڕ مانا بەرزەی قورئاندا، گەورەیی ئەو زاتەمان بۆ دەردەکەوێت چەندە بەسۆز بووە چەندە خەمخۆری باوکی بووە، لەپێشدا ئەم باوکەی تاکە خەمی بووەو پاشان گەلەکەی هەروەك لەپێشدا باسمان کرد، ئەمانە بەم سۆزە بەرزەی

(١) (نبي)و(رسول) دوو شێوەی جیان لەپێغەمبەران، (نبي) ئەو پێغەمبەرەیە کەخاوەنی پەرتوك نیەو تەنها لەسەر پەرتوکی پێشوی خۆی دەڕوات، (رسول) ئەو پێغەمبەرەیە کەخاوەنی کتێبی خۆیەتی. وەهەموو (رسول)ێك (نبي)یە بەلاٚم هەموو (نبي)یەك (رسول) نیەو ئیبراهیمیش (رسول)ە چونکە (صحف)ی بۆ هاتووە.

(٢) تفسير الكبير (مفاتيح الغيب) /للامام فخرالدين الرازى/ ج ٢١ ـ ٢٢ (ص: ٢٢٦).

خۆیـان پـەیڕەوەکان خوایـان گـەیاندوە، ئەمانـە وەك نمونـەی دارێکـی بـەرداروابوون کـاتێك خەڵکی بەردی تێبگرتنایە ئەوان بەریان تێدەگرت، بەرامبەر بەم هـەموو سـۆزەش ئـەوەیان لەبیربوو کەهەردەم دەبێت خۆشەویست بن، ئەگەر هاتوو بونە جێی ئەوەی کەخوای گەورە بڕەنجێنن و زویری بکەن ئەوا دەبێـت هـەردەم لایـەنگری خـوای پـەروەردگار بکرێـت و هـەوڵ بدرێت بهێنرێنە سەر ڕێگەی ڕاستی، ئەگـەر هـاتوو نـەهاتن ئـەوا دەبێـت خـوای گـەورە چـی پێخۆشە ئەوەیان لەگەڵدا بکرێ.

لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت بانگ خوازانی خوایی هەردەم هەوڵ و تەقەلایان لەگەڵدا بـدەن، وەبەتایبەتی لەم سەردەمەی ئێستای ڕابوونی ئیسلامیدا، کەبەراستی بـانگخوازان زۆر زیـاتر لە هەمووشتێك پێویستییان بەم نەرم و نیانییەی (ئیـبراهیم) ئاسـا هەیـە چونکـە خـەڵکی پاکن، بێ گەردن هـەروەك دەفرێکـی بێگـەرد وان بـانگخوازانیش بریتـین لەوکەسـەی هـەوڵی پڕکردنی دەفرەکە دەدات بەهەنگوین، جاڵەگەرێت و باشی تێناگات و لەسەرخۆو وریا نـەبێت ئەوا دەفرەکە هەرگیز ئەو هەنگوینە ناگرێتە خۆی و دەڕژێتە سەر زەوی و لەهـەمان کـاتدا ئـەم (هەنگوینـە) چـەندە بەقیمەتـە چـەندە ڕێـزدارەو، هـەرگیزو هـەردەم دەفرێك شایەنی ئـەم نەبێت، شایەنی هیچ جۆرە شتێکی ترنیە بیگرێتە خۆی.

کەواتـە بـانگخوازان لـەتێکردنی هـەنگوینی خوایـیدا زۆر پێویسـتیان بەنـەرم و نیانی و لەسەرخۆیی هەیە، دەبێت وابین ئەگـەر وانـەبین و قسـە ڕەق و بێدانـایی و زانیـاری بـین ئـەوا هـەرگیز ناشـێین بۆهـەڵگرتنی ئـەم سـپاردە گەورەیـە، ئـەو سـپاردەیەی کەشـاخەکان نەیانگرتەخۆ.

.. گـەورەی ئـەم بـەڕێزەو ڕێـزداری لـەکردارو ڕەفتـاریدا بەتـەواوەتی لـەم ئایەتانـەی سەرەوەدا دەردەکەوێتە هەر بۆیە خوای گەورە لە بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿ومن احسن دینا ممن اسلم وجهه الله وهو محسن واتبع ملة ابراهيم حنيفا واتخذالله ابراهيم خليلا﴾ (النساء: ١٢٥).

واتە: کام پەیڕەو کام پرۆگرام و کام کەس لەوە باشتر هەیـە کـەخۆی سـاغ کردبێتـەوە بۆ خوای تاك و تەنها و چاك و چاکەخوازبێت و شوێن کەوتەی پەیڕەو پرۆگرامی ئیبراهیم (علیه السلام) بێت، وەئیبراهیم بەڕاستی خوای گەورە هەڵیبژاردووە بەخۆشەویست و ڕاستگۆ.

خۆشەویستی خوای گەورە بۆ یەکێکە کەشـایەنی بێـت (ئیـبراهیم) ئاسـا تێکۆشـەربێت لەگەیاندنی پەیامی خوایدا، نەرم و نیان و دڵسۆز بێت لەگەڵ بەندەکانی خوادا. دڵ پەیوەست بێت لەگەڵ پەروەردگاریدا.

بەڵێ... ئازیزان ئیبراهیم ئەوەندە بەرێزبوو خەمخۆری سەرەکی بانگی خوایی بوو، بۆیە جولەکە و گاورەکان هەریەکەیان دەیویست کەبڵێن ئیبراهیم لەئێمە بوو، بەڵام خوای گەورە باوەڕی پاکی ئیبراهیمی بۆ باس کردنو فەرمووی: ﴿ماكان ابراهيم يهوديا ولانصرانيا ولكن كان حنيفا مسلما وماكان من المشركين﴾ (ال عمران: ٦٧).

واتە: ئیبراهیم نەجولەکەبوو، وەنەگاور، بەڵکو پەیڕەو باوەڕێکی پاکژی هەبوو، دوور لەتێکدەریو شێواوی پەیڕەوی جولەکەو گاور، وەلە هاوەڵ قەراردەرانیش نەبوو.

هەردەمو لەهەموو کاتێکدا هەوڵ دراوە بۆ ئەوەی پیاوانو چاك خوازانی ئاوا کۆمەڵێکی ڕەوشت خراپ دایتاشن بەلای خۆیاندان هەتا لەژێر پەردەی ناوی ئەو چاك خوازە خوایەیدا، مەرامە پیسەکانی خۆیان بهێنێتەدی.

## ناساندنی پەروەردگاری ڕاستەقینە بەمرۆڤەکان

پاش ئەوەی کەئیبراهیم (عليه السلام) بەرهەڵستی هەموو بتەکانی کۆمەڵگەکەی کرد و هەردەم لەهەوڵی پوچەڵ بوونەوەی خوایەتی ئەم بتە بێسودانەدا بوو لەگەڵ ئەمانەشدا کارێکیتری ئەنجام دەدا، کەبەڕاستی کارێکی زۆر پیرۆزە، ئەویش ناساندنی پەروەردگاری ڕاستی مرۆڤەکان بوو بەمرۆڤەکان.

کەهەڵی بژێرن بەتاکە خوای خۆیانو تەنها داوا لەویکەنو تەنها کڕنوشی گەورەیو خاوەندارێتی بۆ ئەو زاتە ببەن، هەردەم ئەبێت وابێت، کاتێك هەوڵ دەدەیت بیروڕای بەرامبەرت پوچەڵ بکەیتەوە، دەبێت خۆت هەڵگری بیروڕاو پەیڕەوێکی باشترو بەسودترو خزمەت گوزارتربیت لەوەی بەرامبەرت، نەك خەریکی پوچەڵ کردنەوەی بەرامبەرت بیت لەکاتێکدا خۆت بێبەشی لەهەموو ڕاستیەك.

چۆنیەتی ئەم ناساندنە لەقورئانی پیرۆزدا لەزۆر شوێندا خوای گەورە هەستو نەستی مرۆڤەکانی بۆلا ڕادەکێشیو دەیکاتە ئەزمونێکی مێژووی گرنگو بەسود بۆ بانگخوازانی ڕێگەی خوایی.

لەسورەی (الشعراء)دا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فانهم عدوّلي الا رب العالمين* الذى خلقني فهو يهدين* والذى يطعمني ويسقين* واذا مرضت فهو يشفين* والذي يميتني ثم يحين* والذى اطمع ان يغفرلي خطيئتي يوم الدين﴾ (الشعراء: ٧٧ - ٨٢).

واتە: ئەوانەی کەئێوە دەیپەرستن هەموویان دوژمنی منن تەنها خوای گەورەی جیهان نەبێت، ئەو پەروەردگارەی کەلەنەبوونەوە منی هێناوەتەدیو پاشان یارمەتی دەرو

هیدایەت دەریشمە لەدونیاو لەدوارۆژیشدا بۆ ڕێگەی ڕاست، ئەو پەروەردگارەی کەرۆزی دەرمەو بەخشەری سودە بەو ڕۆزیە، مانای لەگەڵ ئەوەشدا کەرۆزیەکەم دەداتێ، بەهۆی ئەو ڕۆزیەشەوە تێرم دەکات، وەکاتێك نەخۆش کەوتم شیفادەرو چاك کەرەوەمە.

ئەو پەروەردگارەی کەدەممرێنێ کاتێك کەئەجەلم هاتو زیندوشم دەکاتەوە لەڕۆژی دوایدا، ئەو پەروەردگارەی کەهیوام وایە کەلەتاوانەکانم خۆش بێت لەڕۆژی دوایدا.(١)

بەڵێ... ئەوپەڕی گەورەی پەروەردگار لەم وەسفە جوانەی ئیبراهیمدا دەردەکەوێت، ئاوایە ئەو پەروەردگارەی کەمرۆڤەکان پشتی تێدەکەن، ڕوی لێوەردەگێڕن، زۆرجار لەیادیاندا نامێنێ، بەڵکو مەخابن زۆر لەبەندەکان هەرگیز یادی ناکەن.

ئەو زاتەی کەبەهەموو سەرسوڕهێنەرەکانەوە دروستی کردویت، بەدیهێناویت لەنەبونەوە، هیچ کەس ناوتی نەبیستبوو، کەس وێنەتی نەدەناسی، کەس لەمرۆڤەکان باسیان نەدەکردی، سەرزەوی لەهیچ کەلێنێکیدا تۆی تێدا بەدی نەدەکرا، بەلام هاتینە بوون، پەروەردگاری هەموو شتەکان تۆی هێنایەبوون، پاشان هەر لەدوای ئەو بوونە، لەشوێنێکدا ڕۆزی دەرت بوو کەهیچ کام لە خۆیستەکانت، ئاگایان لێت نەبوو بەلام فرامۆشی نەکردبووی ئەو زاتەی کەدروستی کردی، بۆیە ئیبراهیم (عليه السلام) دەفەرموێ ڕۆزی دەر..هێشتا چاوت نەهێنابووە سەر ڕۆشنای گەردون هەرزۆری بۆ ئامادەکردبوویت، دوکارگەی بەرهەم هێنانی (شیر)، کام شیر؟ ئەو شیرەی کەئەمرۆی زانست جەخت لەسەر ئەوە دەکات کەمناڵەکان بیخۆنو جگە لەم شیرە، دەستکردەکان نەخۆن.

پاشان بەم ڕۆزیە لەبەدیهێنراوێکی ئێجگار بچوکەوە دەتکات بەمرۆڤێکی سەیرو سەمەرە، سەیرو سەمەرەی لەهەموو لایەنێکدا بۆ نموونە:

ئیماندار تەنها لەگەدەدا خوای گەورە (٣٥) ملیۆن گرێی ئالۆزی بۆ دروست کردوین بەتەنها بۆ ئەزم کردنی خواردن.

یەك (١) ملیار خانەی لەناو گەدەدا بۆ داناوی تەنها لەبەرئەوەی ترشەلۆکی گەدەتت بۆ دەربکات.

---

(١) پێغەمبەران لەزۆر خۆبەکەم گرتنەوە دەفەرموون کەلەگوناهەکانما خۆش بی. هەروەك د/مصطفى خرم دل لەتەفسیرەکەیدا دەفەرموێت: ـ (استغفار الانبياء تواضع منهم لربهم وهضم لانفسهم، وتعليم للأمم فى طلب المغفرة) تفسير المقططف (ص:ـ ٦٨٩).

واته :دلوای لێخۆشبونی پێغەمبەران، دەربڕینی خۆبەکەم گرتن بووە بۆ پەروەرنگاریانو بۆ فێرکردنی نولکەوتوەکانیان بووە، کەلەپەروەرنگاریان بپاڕێنەوە مانای خودی خۆیان بێگوناه بوون.

تەنها لەیەك (دەقیقە) خولەكدا (٧،٥٠٠،٠٠٠،٠٠٠) حەوت هەزارو پێنج سەد ملیۆن خانە لەجولەی ڕۆژانەتدا نامێننو هەر لەهەمان كاتدا ئەوەندەیتر لەجێگەیاندا دروست دەبنەوە[1]

بەڵێ.... ﴿الذي خلقني فهو يهدين﴾ دروست كەرەكەی مرۆڤ پەروەردگارە لەسەر ئەم شێوە سەمەرەیە، ئەو پەروەردگارەی كەئیبراهیم دەیویست بەخەڵكی بناسێنێ لەكاتی ناساغی، جەستەو دڵیشدا، خاوەنی چاك كردنەوەیە بۆ بەندەكان چەند خۆشەو چەندە بەتامە لەكاتەكانی نەخۆشی جەستەدا، كاتێك هەست بكەیت كەزاتێكی بەتواناو بەدەسەڵات شیفادەرتەو، لەو نەخۆشیە ڕزگارت دەكات، ئەمە لەناساغی جەستەدا، ئەی ئەگەر بێتو ناساغیەكە، ناساغی دڵ بێت، شتە ماددیەكان چارەسەری ناكەن، هیچ كام لەدەرمانو دكتۆرەكان بۆیان چارەسەر ناكرێت، بەڵام ئەگەر خوای خۆت ناسی كەشفادەرەو چاك كەرەوەی شتەكانە، ئەوا ئەو كات یەكسەر پەنای بۆ دەبەیتو بەڵكو هەر بەیادكردنی ئەو زاتە دڵە خورپێو ناساغی نامێنێت هەروەك خۆی خاوەن شیفا دەفەرموێت: ـ ﴿ألا بذكر الله تطمئن القلوب﴾ (الرعد: ٢٨).

واتە: ـ ئایا تەنها یادی پەروەردگارنیە كەدڵەكان ئارامو خۆشحاڵو شادو چاك دەكات.

بەڵێ... ئەو پەروەردگارەی كەكۆتایەكی مردنی بۆ داناوەو پاشان زیندوبوونەوەیەكیش زیندووم دەكاتەوە بۆ ئەوەی پاداشتی چاكەكانم بداتەوەو بەهەشتی كۆتای نەهاتووم بۆبكات بەمەنزڵ، ئەمەیە پەروەردگاری ڕاستەقینە كەئیبراهیم (عليه السلام) بەخەڵكی دەناسێت، جوانترین ناساندنو ڕاستكۆترین بەڵێن، كام بەڵێن؟

بەڵێنی پاداشت دانەوە لەسەرچاكەكان، بەڵێنی خۆشی باخەكانی بەهەشت، بەڵێنی ژیانی نەبراوە، بەڵێنی ئەوەش كەبەرامبەر خراپەكانی ناخۆشیو ئازار هەیە لەلای پەروەردگارەوە.

پاشان جارێكی تریش خوای گەورەیان پێدەناسێنێتەوەو پێیان دەڵێت هیوام وایە كەخوای گەورە لەتاوانەكانیشم خۆش ئەبێت بەزەیی بێ سنوری پەروەردگاریان بۆ دەردەخات، دڵ خۆشیان دەكات بەوەی كەپەروەردگاریان بەسۆزە، گەربێتو تاوانیش هەبێت زۆرجار لێبووردەیە بەرامبەری.

---

(١) مع الطب في القران/د.عبدالحميد دياب، د. احمد محمود قرقوز/ (ص: ٣٩ ـ ٤٠).

جوانترین‌و باشترین‌و گەورەترین بۆچون هەیە لەم جۆرە وەسفەدا، بۆچونێك كەجگە لەم ئایەتانە هیچ كام لەبەرنامەكان ناتوانن دروستی بكەن بۆ ئەنجامێك، كام ئەنجام؟ (یوم الدین) ئەنجامی ڕۆژی دوای، ئیتر كام كەس باش دەكات‌و چاك دەڵێت‌و باش خوازدەبێت، ڕووناكیەكی دڵسۆز دەبێت، مۆمی شەوە تاریكەكان دەبێت، كەشتی ڕزگاركەری مرۆڤەكان دەبێت، ئەوەپاداشتەكەی وەردەگرێت‌و ئەنجامی خۆی دەبێت.

هەركەسیش ... دڕكی ناو باخچەكان دەبێت‌و پیسكەری سەرچاوەكان بێت‌و ڕوخێنەری هەست‌و سۆزەكان بێت ئەوا، دەرئەنجامێكی هەیەو ڕۆژگاری دوای خۆی دەزانێ.

ئەم پەروەردگارە بوو ئیبراهیم بەخەڵكی دەناساندو، پێی‌دەوتن بیپەرستن، ئەم زاتە بوو كەشایەنی كڕنوش بردن بێت، ئەم نورە بوو كەشایەنی هەڵگرتن بێت بۆ تاریكیەكان، ئەم سەرچاوە سازگارە بوو كەشایەن بێ بۆ دەرونە كوێلەكان.

هەروەها خوای گەورە لەشوێنێكی تردا لەقورئانی پیرۆز باس لەم ناساندنە دەكات‌و دەفەرموێت: ﴿قال بل ربكم رب السماوات والارض الذى فطرهن وانا على ذلكم من الشاهدين﴾ (الانبياء: ٥٦).

واتە: ئیبراهیم ووتی: بەڵكو پەروەردگارتان كەشایەنی پەرستن بێت، بریتی لە پەروەردگاری ئاسمانەكان‌و زەوی كەدروستی كردن‌و بەدی هێناون لەنەبوونەوە، كەئەمەش تەنها لەتواناو دەسەڵاتی خوای تاك‌و تەنیادا هەیە، وەمن سایەت‌و ڕاستگۆو زانیارم لەسەر ئەم ڕاستیە كەدەیڵێم.

هەر ئەبێت وابێ ئەو زاتەی كەكڕنوشی بۆ دەبرێت، ئەو زاتەی كەبەڕێزترین شوێنی مرۆڤ بۆ دەچێتە سەر زەوی، ئەبێ بەدیهێنەری زەوی‌و ئاسمانەكان بێت، بەهەموو سەرسوڕهێنەرەكانیانەوە، بەئەستێرە گەورەكانەوە، بەمانگ‌و ڕۆژەكانەوە، بەگازەكانەوە بەدەریاكانەوە، بەشاخەكانەوە، بەهەموو گیان لەبەركانەوە، بەمرۆڤەكانەوە،

ئەبێ ئاوا پەروەردگار بناسرێت، ئەگەر وانەبوو هەرگیزو لەهیچ كات‌و شوێنێكدا كەس شایەنی ئەوەنیە گوێڕایەڵ بكرێت، جگە لەوزاتەی كەئەم سیفەتانەی تێدایە، هیچ زاتێك شایەنی لێ ترسان نیە زاتێكی بەدیهێنەر نەبێ هیچ كەس شایەنی ئەوەنیە داوای لێبكرێ زاتی پەروەردگار نەبێت.

ئابەم شێوەیە ئیبراهیم (علیه السلام) بۆچونی پڕماناو پەیڕەوی پڕ حیكمەت‌و پرۆگرامی گونجاوی پێشكەش گەلەكەی دەكرد، لەپێشدا ئەو جۆرە بیركردنەوەیەی ئەوانی پوچەڵ كرد، پاشان لەگەڵ ئەوەشدا بیرو پەیڕەو پرۆگرامێكی ئاواها جوانی تری پێگەیاندن

کەئەگەر مرۆڤەکان لەهەر سەردەمو لەهەر شوێنێکدا بن تەنها تۆزێك خاوەن بیر (عەقل) بن بێ‌قەیدو شەرت وەری دەگرن‌و پەیڕەوی ژیانیانی لەسەر پەیڕەو دەکەن.

هەروەها لەباخێکی‌تر لەباخەکانی قورئانی پیرۆزدا خوای گەورە بەشێوەی بەرامبەری (ئیبراهیمو گەلەکەی) ئەم ناساندنەمان بۆ باس دەکات، کەئەم جارەیان ئیبراهیم ئەوەندەیان لەگەڵدا هەوڵ دەدات نمونەیان بۆ دەهێنێتەوەو باس لەدوارۆژی خراپەکارانیشیان بۆ دەکات.

هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿انی وجهت وجهی للذی فطر السماوات والارض، حنیفا مسلما وما انا من المشرکین* وحاجه قومه، قال اتحاجونی فی الله وقد هدانی، ولا اخاف ماتشرکون به الا ان یشاء ربی شیئا، وسع ربی کل شیء علما، افلا تذکرون* وکیف اخاف ماشرکتم ولا تخافون انکم اشرکتم بالله مالم ینزل به علیکم سلطانا، فأي الفریقین احق بالأ من ان کنتم یعلمون* الذین امنوا ولم یلبسوا ایمانهم بظلم اولئك لهم الامن وهم مهتدون* تلك حجتنا اتیناها ابراهیم علی قومه، نرفع درجات من نشاء، ان ربك حکیم علیم﴾ (الانعام: ٧٩ ـ ٨٣).

واتە: من ڕوودەکەمە پەرستن‌و گوێڕایەڵی کردنی ئەوزاتەی کەبەدیهێنەری ئاسمانەکان‌و زەویيە، پاکژودوور لەهەموو لەرێ‌لادان‌و گومراییەك‌و هەرگیز من لەهاوەڵ قەراردەران نیم، لەو کەسانە نیم کەجگە لەزاتی ئەم بەدیهێنەرە پەروەردگارێك‌و خوایەکی‌تر هەڵبژێرم.

پاشان کۆمەڵگەکەی دەستیان کرد بەبەرهەڵستی‌کردنی‌و دەمە دەمێ‌کردن لەگەڵیدا کەخوایەکی تاك‌و تەنها هەبێت، ئیبراهیمیش پێی ووتن: ـ ئایا ئێوە دەمە دەمێم لەگەڵدا ئەکەن لەسەر یەکتاپەرستی خواو دەمترسێنن بەوەی کەبتەکانتان دەستم لێ‌ئەوەشێنن، لەکاتێکدا کەمن ڕێگەی ڕاست‌و دروستم پێ‌بەخشراوە لەلایەن پەروەردگارمەوە، بەڵکو هەرگیز ناترسم لەهەڕەشەی درۆی ئێوەو هەرگیز هیچ شتێك نابێت، تەنها ئەوانە نەبێت کەخوای گەورەم بیەوێت واتە تەنها شتێك زەرەر یاخود قازانجم پێ‌دەگات کەویستی خوای لەسەربێ، لەبەرئەوەی کەبەڕاستی پەروەردگارم بەتوانایە بەسەر هەموو شتێکداو زانیارە بەهەموو شتێکە لەکاتێکدا خواکانی ئێوە ئاگای لەهیچ شتێك نیە، ئایا بیرناکەنەوە کەچەندەیان جیاوازی هەیە؟

چۆن من بترسم لەو خوایە بێ‌مانایەی ئێوە کەبتەکان‌و ئەستێرەکانن لەکاتێکدا ئێوە

ناترسن‌و شەرم ناکەن، کەجگە لەخوای تاک‌و تەنها شتانێکی‌تر دەپەرستن‌و هاوەڵتان قەرارداوە بەبێ هیچ بەڵگەو، ڕاستیەك لەسەر ئەوەی کەشایەنی پەرستن بن! !

ئایا کام لەمن‌و لەئێوە هەقوایە کەدڵ ئارام بێت‌و نەترسێت ئەوانەی کەهاوەڵیان بۆ خوا قەرارداوە یان ئەوانەی کەتەنهاو هەر خوایەکی تاك‌و تەنها دەپەرستن؟ ئەگەر ئێوە خاوەن ژیرین‌و دەزانن؟... بەڵکو ئەوانەی کەباوەڕیان هێناوە بەتاك‌و تەنهای خوای گەورەو پاشان هیچ شتێك‌و هیچ پەرستنێك جگە لەخوا بۆ کەسی‌تر نەکردوە، ئەوانە زیاتر شایەنی ئەوەن کەدڵ ئارام بن زیاتر لەهەموو کەس ، هەر ئەوانەشن بەڕاستی ڕێگەی هیدایەت‌و سەرفرازیان گرتۆتەبەر.

ئەمە ئەو بەڵگە گەورەیەیە لەسەر خوایەتی و تەنهای خوای کەدامان بە ئیبراهیم بۆ ئەوەی بیگەیەنێ‌و زاڵی بکات بەسەر گەلەکەیدا. هەربەو شێوەیە هەر کەسمان بوویێت بەرزی دەکەینەوەو ڕێزی لێدەنێین، کەبەڕاستی ئەم ڕێزلێنان‌و بەڕێزکردنە بێهودەنیە، چونکە پەروەردگارت داناو حەکیمە کەکێ شایەنیەتی‌و، زانیارە بەوەی کێ دەکات‌و کێ ناکات.

... ئەمەیە ئەوپەڕی جوانکاری لەگوفتاری ڕوویەڕوویونەوەدا ئەوەیە ئەو هەستەی کەپۆڵاین ترە لەهەموو شاخەکان گەورەترە لەگشت دەریاکان، ئەو باوەڕەی کەهەر چەندە خاوەنەکەی بەقەبارە بچوك بێت گەورەی دەکات، هەرچەندە بێهێزو کەم بێت بەهێزی دەکات، ئەمەیە باوەڕی ئیبراهیمی (علیه السلام)، بەرامبەر ی ئەمەش، ئەو باوەڕەیە کەوەك کۆشکە بێبنچینەکان وان، وەك مێشکە سنگ بەرزەکان وان وەك جۆگەلە لێڵەکان وان، ئەو باوەڕەی کەژێری منداڵەکان بەقسەی نەستەقی کاتەبێئێشەکانیانی ئەزانن، باوەڕێك کەباوەڕپێکراو هەستی‌نیە، بێدەسەڵاتە بێدەستە، ئەگەر بێت‌و مرۆڤیش بێت، واتە ئەوەی کەبەقسەی دەکرێت‌و لێی دەترسێت بامرۆڤێکی دەسەڵات داریش بێتن هەرگیزو هەردەم لەبەرامبەر گەورەی‌و دەسەڵاتی پەروەردگاری راستەقینەدا هیچ گەورەیی‌و دەسەلاتی نیە، ڕەگی ئیمان زۆر لەوە قوڵترە کە خاوەنەکەی جگەلە خوای گەورە کەسێکی‌تر بێت، لەبەرئەوەیە کەئەم باوەڕهێنان‌و ناساندنی خوایە بەخەڵکی گرانە، دەبێت خەڵکی تێبگەن کەجگە لەخوای گەورەو تاك‌و تەنها کەسێکی‌تر شایەنی پەرستن نیە، ئیتر پەرستن بەهەموو جۆرەکانیەوە لەهەموو هەڵسوکەوتێکدا، واتە کاتێك کەدەڵێت خوا دەپەرستم بەتاك‌و تەنها دەبێت، لەحاڵ‌و بازاڕو دوکان‌و جل‌وبەرگ‌و گوفتارو ڕەفتاریشدا ئەو خواپەرستیە ڕەنگ بداتەوە، هەموویان بەجۆرێك بن کەخوا بۆی داناوی، ئەگەر هاتوو بەوشێوەیە بوو، ئەوا لەوئیمانەیە کەخوای گەورە لەم دەقەدا وەسفی کردن‌و دەفەرموێت:

﴿ ولم يلبسوا ايمانهم بظلم اولئك لهم الامن واولئك هم المهتدون﴾. (الانعام: ٨٢)[1]

بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی ئەم دەقە شیرینە دەچینە خزمەت ووتەی شیرینی پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) کەدەفەرموێت: ((من اعطى فشكر، ومنع فصبر وظلم فاستغفر وسكت، قال: فقالوا يارسول الله ماله؟ قال اولئك لهم الامن وهم مهتدون))[2]

واتە: هەرکەس خێرو بەرەکەتێکی پێدراو سوپاس گوزاربوو لەسەری‌و هەرکەس ڕێگری کراو خەتای لەگەڵدا کرا بەڵام ئەم هەر ئارامی گرت لەسەری، و هەرکەس کاتێك تاوانێك دەکات داوای لێخۆش بوون دەکات..، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) بێدەنگ بوون، هاوەڵان دوای ئەم بێدەنگیە ووتیان:ـ ئەی پێغەمبەری خوای گەورە ئەمانە چین؟

فەرموی:ـ ئەمانە ئاسایش‌و دڵ ئارامیان بۆ هەیە، و بەڕاستی ئەمانە ئەو کەسانەنە کەڕێگەی ڕاست‌و دروستیان بۆلای پەروەردگاریان هەڵبژاردووە.

بەڵێ... خوێنەری ئازیز ئەمەبوو بەشێکیتر لەژیانی ئەم پێغەمبەرە بەڕێزەو گەیاندنی بەرنامەی خوای لەسەر جوانترین شێوەو ناساندنی خوای مرۆڤەکان کەبەڕاستی لەچەند ووتەی پێشوودا بۆمان دەرکەوت ئەم ئازیزە (عليه السلام) چەندە گوفتار شیرین‌و جوان بێژو ووردبێژبووە، چەند دامەزراو بووە لەسەرباوەڕەکەی.

## پەندو ئامۆژگاریەکانی بەندی دووەم

(**١**) هەموو ئیمانێك ئازیزان.. پێویستی بەتێکۆشان هەیە بۆ بەدەست هێنانی، ئەو تێکۆشانە دەبێت داواکەری ئیمانەکە پێی هەڵبسێتن ئەو داواکاری ئیمانەش دەکرێن بەدوو بەشـی سەرەکیەوە لەخەڵکیدا بەگشتی‌و هەوڵەکانیشیان بەپێی هەریەکەیان دەگۆڕێ:ـ

**أ**) ئەو کەسانەی کەخوازیاری ئەوەن کەژیانی ڕۆژانەیان‌و ڕاستی شتەکان لەبەرنامەیەکدا بەدیبکەن،و باوەڕی پێبهێنن ئەمانە کەسانێکی وەك ئیبراهیمن دەیانەوێت ڕاستی شتەکان بزانن وەك خۆی‌و ڕۆژگاری هەڵسوکەوتیان بەپێرەوێکی دروست‌و (واقعی) ببیات بەڕێوە پێویستە ئیبراهیم ئاسابێت بۆ تێکۆشان بەدوای ئەو پەیڕەوە ڕاستەدا، ئەوانەی کەلەدورەوە سەیری (ئیسلام) دەکەن‌و لەناخی تێناگەن، ئەوانەی دەرمانخانەیەك نادۆزنەوە بۆ سارێژی برینەکانیان، بابێن بەچاوی زانیاری‌و بیرو هۆشەوە سەیرێکی ئەم

---

(١) ڕاڤەی ئەم ئایەتە پێرۆزە پێشترکرا.

(٢) تفسير القران العظيم/لابن كثير (ص: ١٤٣) طبعة محققه/ دار اليوسف.

پەیڕەوەبکەن‌و پاشان سەیری بەرامبەرەکانیشی بکەن، زۆر ستەمە، ئیبراهیم خوایشی نەدەناسی‌و بەرنامەی خوایشی نەبینی‌بوو کەچی هەر لەکۆتای‌دا خۆی دایە دەستی پەیڕەوی خوای.

کەچی ئێستا هاوار دەکرێت لەخەڵکی بۆئەوەی پەیوەستی ئەم بەرنامە خوایە بن، بەڵام مەخابن نایگرنە خۆیان.

ئەی ئەوانەی کەتەنها گوڵی بۆن خۆشی ئیسلامتان لەدەستی خوێناوی گومڕاکاندا بینیوە، ئەی ئەوانەی کەبۆنی خۆشی ئیسلامتان هەڵنەمژیوە، وەرن ڕاستی ئیسلام بەبیرو هۆش وەربگرن وەرن تەنها پەیڕەوی ڕاستەقینەی بێ کەم‌و کورتی ژیانمان هەڵبژێرن ئەوانەی کەئیسلامیان لەدەمی پیسی دوژمنانیەوە ناسیوە، بێ بەشن لە(شنە ئێوارانی ناو باخی قورئان) بێ‌بەشن لەبۆنی خۆشی فەرمودەکان دوورن لەسۆزی دووری پەروەردگاری جیهانیان، دوور خراوەن لەشیرینی چێژی براکان، لەبەرئەوە ئیبراهیم (علیه السلام) بەژیری‌و بیرکردنەوە دەگەڕا بەدوای پەیڕەوی ژیانیدا، بەرهەڵستی هەموو کۆمەڵگەکەی کرد لەبەرئەوەی ئەم هەموو سۆزو شیرینەی چێشتبوون، هەربۆیە خوای گەورەش ئەو هەموو ڕێزو گەورەیەی لێنا، کەهەرکەس بەم شێوەیە بەرنامەی ژیانی خۆی هەڵبژێرێ هەردەم وناوەها سەرفراز دەبێت‌و پەشیمان نابێت لەڕابردووی خۆی‌و لەداهاتووشی دڵ ئارام دەبێت.

پ) دواکەوتوەکانی ئەم ئیمانە: ئەوانەی کەئیمانەکەیان هێناوە بەپەیڕەوە خوایەکەو باوەڕدارن لەسەری‌و ژیانیان لەسەری دەبەن بەڕێوە، ئەمانەش زیاتر پێویستیان بەتێکۆشان هەیە بۆ زیاتر دامەزراندنی ئەم ئیمانە، ئەویش بەوە دەبێت کەئەم باوەڕهێنانە بەزانستەوە بێت‌و لەسەرچاوو ڕوونی بێت، نەك چاولێکەری‌و، زاناو زانیارین بەوزاتەی کەباوەڕیان پێ‌هێناوە، هەوڵدەرین هەردەم بۆ دروست کردنی باشترین پەیوەندی لەگەڵ ئەو زاتەداو ڕۆچووین، لەتێگەیشتن لەپەیڕەوەکەیان، لەسەروو هەموو ئەمانەشەوە درووست کردنی باشترین خۆشەویستی‌و تەپایی لەگەڵ خاوەن پەیڕەوەکە، کەخوای گەورەیەو زیاتر متمانە بوون پێی، چونکە ئەمانە هەمووی دەبنە بەردێکی زۆر پتەو لەبناغەی ئەو ئیمانەداو هەردەم دەیپارێزن لەپیاکێشانە دەرەکیەکان، هەروەك چۆن ئیبراهیم (علیه السلام) تەنها مرۆڤێك بو بەرامبەر هەموو هێزەکان وەستا.

بەتایبەتی بانگ خوازان.. زۆر پێویستیان بەم جۆری دووهەمە هەیە لەتێکۆشان، چونکە ئەمان خەڵکی لەجێی پێغەمبەران بانگ دەکەن بۆ سەر بەرنامەی خوا، وەئاشکراشە کەهەردەم پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) زیاتر لەهەموو کەس

تاقیکراونەتەوە،و چەکوشە گەورەکانی ناخەزان دراوە لەکۆشکی باوەڕیان بۆئەوەی بیڕوخێنن، هەروەك پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) لەفەرمودەیەکیدا دەفەرموێت: ((اشد الناس بلاء الانبياء ثم الصالحون ثم الامثل فالامثل))

واتە: زۆرترین کەسانێك کەتاقیکردنەوەیان توش ببێتو ئازارو ئەشکەنجەو نەبونیو بێجێگەیو بێڕێگەییان توش ببێت بریتین لەپێغەمبەران، پاش ئەوان بۆ خوا گونجاوان ئەوانەی کەهەڵسوکەوتیان گونجاوە لەگەڵ داواکاریەکانی خوا، پاشان ئەوانەی لەوان کەمتر بەو شێوەیە، ئەم فەرموودە شیرینەی ئازیزمان (علیه الصلاة واسلام) زۆر باش ئاشکرای دەکات کەئەم تاقیردنەوانە لەهەموو کەس زیاتر، بانگ خوازان دەگرێتەوە، چونکە بانگ خوازی کاری پێغەمبەرانە (علیهم السلام)، کاتێك ئەم تاقیکردنەوەو ئازارو ئەشکەنجانە ڕوو دەکاتە بانگ خواز، پێویستە دامەزراوبێتو سوربێت لەسەر گەیاندنی ئەو بانگی ڕاستیە، وەئەم سووربونەشی هەرگیز لەمرۆڤی ئاسایدا بەدی ناکرێت، چونکە خودی مرۆڤ بەشێوەیەکی بێبەرگریو بێهێز دروست کراوە لەچاو ئەم ناڕەحەتیانەدا هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وخلق الانسان ضعيفا﴾ لێرەدا تەنها بەهێزکەرێكو یارمەتی دەرێك بۆ هەڵگرتنی ئەم بانگە، بریتییە لەیارمەتی خوای، متمانە بوون بەوەرگرتنەوەی پاداشتی ئەمو کاری بانگەوازیە هەرچەندە گرانیش بێت، شتانی لەوەگرنگتر هەیە، هەر وەك شاعر دەفەرموێت: ـ

**والصبر فى النائبات صعب ولكن فوت الثواب اصعب**

بەڵێ... ئارامگرتن لەتاقیکردنەوەکاندا ڕاستە گرانە، بەڵام لەوە گرانتر بریتییە لە، لەدەست چونی پاداشتی ئەو ئارامگرتنە لەلای خوای گەورە.

(٢) دوورەپەرێزی لەشوێن کەوتنی کوێرانەی هەموو پەیڕەو بەرنامەیەك، بەو واتایەی کەکاتێك مرۆڤ بەرنامەیەکی ژیانی خۆی هەڵدەبژێرێ پێویستە ئەم هەڵبژاردنە لەسەر بناغەی تێگەیشتنو تێڕامان دروست بوویێ، بەبیرو هۆشەوە دواکەوتنی خۆی ڕابگەیەنێ بۆ ئەو بەرنامەیە، هەروەك چۆن ئیبراهیم (علیه السلام) هەستا بەهەڵبژاردنی پەیڕەو بەبیرکردنەوە، بەتێڕامان، نەك کوێرانە دوای بت پەرستییەکەی باوکو دایکو کۆمەڵگەکەی بکەوێت.

مەخابن کەخەڵکانی ئەمڕۆ هەر کوێرانە دوای پەیڕەوەکان دەکەون، بێئەوەی بزانن کێدایمەزراندوە، مەبەستی چییە لەم دامەزراندنە، ئامانجی چیە، لەهیچ کام لەمانە ناکۆڵێتەوە کوێرانە دوای دەکەوێت، بۆیە کاتێك دەزانێ لەگێژاوی تاوانکاریو دوور لەخوایدا نوقم دەبێت.

بەتایبەتی خەڵکانی موسڵمان، ئەوانەی لەناسنامەیان نوسراوە (مسلم) موسڵمانن ئەمانە بەداخەوە زۆرجار بەچاو نوقاندنەوە شوێن بەرنامەکان دەکەون‌و لاسایی بەرامبەر دەکەنەوەو پاشان دەبن بەپاشکۆی بەرامبەر لەهەموو لایەنەکانی (بیرو ڕەوشت‌و کۆمەڵگە)ش دەبنە دواکەوتەی کوێرانەی بەرنامەکان کەلەهەمان کاتدا نازانن ئامانج‌و بۆچونی دامەزرێنەرانی ئەم پەیرەوە چۆنەو هەوڵ بۆچی دەدەن.

ئینجا جارێکی‌تر، تراژیدیایەکی‌تر[1] یەتەکایەوە لەم باسەدا، ئەویش ئەویە ئەم موسڵمانەی کەلەناسنامەکەی نوسراوە (مسلم)و پێی دەڵێن موسڵمان، خۆی خاوەنی (ئایدۆلۆژیایەکە) بەرنامەیەکە کە تاکە بەرنامەیە ناسراوبێ بە(شمول) گشتگیری لەهەموو لایەنێکی ژیاندا، (ربانی) دانەرو بەدیهێنەری بەرنامەکە (خوای) گەورەیەو دوور لەهەموو تاریکیەك، (واقعی) لەگەڵ کات‌و شوێن دا هەڵدەستێ‌و دادەنیشێ‌و خەیاڵی‌نیە وەك هەندێ پەیرەوی‌تر. لەم هەموو ئەمانە بێ‌ئاگایەو ئەم هەموو چاکی‌یەی بەرنامەی خۆی لەبەرچاو ڕەش بووەو کوێرانە دوای بەرنامەکانی‌تر دەکەوێت.

موسڵمانان بابیرکەنەوەو هەوڵی شارەزابوونی پێویست بدەین لەبەرنامەکان، زۆر گرانە.. ئیبراهیم (علیه السلام) هێشتا بەرنامەی خوای نەدیبوو، بگرە هەر نەیدەزانی دروست کەری بونەوەر کێیە، کەچی هەوڵی گەڕانی دەدا بەدوایدا، ئەی ئێمە لەڕۆژی دواییدا لەبەردەم پەروەردگاردا بڵێین چی؟

ئایا خوا پێمان ناڵێ، ئێوە بۆچی لەغەیری ئیسلام دوای پەیرەوە مرۆڤەکان دەکەوتن، لەکاتێکدا خەڵکی‌و بانگخوازان هاواریان لێدەکردن؟

ئایا ڕووبەڕوەشمان ناکات‌و بڵێ: ئیبراهیم هەر بەگەڕان‌و هەوڵدان‌و تێکۆشان لەبت پەرستی‌و گومڕاییەوە هاتە سەر ڕێگەی ڕاستی خوا، ئەی تۆی بەناو موسڵمان ڕۆژ تانێوار دەتوت: موسڵمانم، بەلاَم ئاگات لەخۆت نەبووە هەموو ژیانت دواکەوتەی ڕێگەکانی غەیری ئیسلام بوو، هاوارت لێدەکرا لەلایەن بانگخوازانی خواوە کەچی هیچ وەلاَمت نەبوو؟

(٣) خوێنەری ئازیز... یەکێکی‌تر لەپەندو ئامۆژگاریەکان ئەوەیە کەهەردەم دەبێت راستگۆ بین لەبیرکردنەوەو بۆچونیشماندا، مانای کاتێك ئەنجامی بیرکردنەوەی ڕاست‌و دروست بەهەر ئاکامێکی گەیاندن، پێویستە دور لەگیانی (تعصب)ەوە سەر بۆ ئەو ئاکامە دابنێین‌و باوەڕمان پێی هەبێت، هەروەك چۆن ئیبراهیم (علیه السلام) بەشێوەی پلە پلەی

---

(١) تراژیدیا (المأساة) ناسۆر .

دەست ی کردە بیرکردنەوەو گەڕان بەدوای، خواداو پاشان کاتێک ئەم بیرکردنەوەیە گەیاندی بەڕاستی، لەئاستی ڕاستیەکەدا ملی کەچ کردو ڕەزامەندی خۆی دەربڕی، ئەبێت مرۆڤ بەم شێوەیە بێت، چونکە تاکە ئامێرێك کەمرۆڤی لەئاژەڵ جیاکردۆتەوە بریتییە لە(ژیری)و، بەم ژیرییە مرۆڤ شتەکان پێوانە دەکاتو ڕاستیو ناڕاستی هەموو شتێکی بۆدەر دەکەوێت هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ولقد كرمنا بني ادم﴾.

واتە: بەڕاستی ئێمە ڕێزمان نا لەنەوەی ئادەم، بەڵام ئەگەر هەڵەو بەپێچەوانەوە بوو، واتە ئەو مرۆڤە خاوەن ژیرییە ژیرییەکەی نەخستەکارو ڕاستی پێ هەڵنەبژارد، و ڕێگەی دروستی ژیانی خۆی لەسەر پەیڕەو نەکرد، ئەوا لەمرۆڤایەتی دەردەچێتو هەستو هۆشو بیرو ژیری هیچ سوودێکی نیەو بۆی هەروەك پەروەردگار وەسفی ئەم جۆرانە دەکاتو دەفەرموێت: ﴿فما اغنى عنهم سمعهم ولا ابصارهم ولا افئدتهم من شيء﴾ (الاحقاف: ٢٦).

وەتاکە شتێك زۆر پێویست بێ لەژیانی مرۆڤدا کەبیری لێبکاتەوە، بریتییە لەدۆزینەوەی ئەو پەیڕەوی ژیانە کەلەسەری ڕۆژانەی خۆی دەبات بەڕێوەو ئهێنی دروست بونی زەوی ئاسمانەکانی پێدەڵێتو هۆی هاتنە بوونی خۆی بۆ دیاری دەکاتو بەجوانترینو بەرزترین شێوە ژیانی بۆ ڕێك دەخاتو ڕاستی دوای مەرگی پێدەڵێتو، ڕێزو گەورەی مرۆڤ دەپارێزێت، لایەنی ڕۆحی پەروەردە دەکاتو گرنگیی دەدات بەلایەنی جەستەیش، هەردەم هانی دەدات کەببێتە گوڵێکی بۆن خۆشی بۆ باخچەی ژیان، دارێکی بەرداری سودبەخش، کانیاوێکی سازگار بۆ دەرونە کەیلەکان.

بەڵێ.. ئازیزان ئەو ژیرییە ڕاستگۆیەکە کەمل بۆ ڕاستیەکان کەچ دەکات چاكو خراپەکان لێك جودا دەکاتەوە.

(٤) بەرنامە خواییەکان، بەرزنو زۆر جیاوازن لەهەموو پەیڕەوەکانی‌تر، ئەویش بەوەی کەلەناو خودی مرۆڤدا هەستێکی وەڵام دەرەوە هەیە بۆیان، ئەویش (الفطرة)یە ئەو خەڵاتە خواییەی دراوە بەمرۆڤەکان، ئەو ئامێرەی وەڵامی خێرای هەیە بۆ بانگی خوای، مرۆڤەکانیش کەخاوەنی ئەم خەڵاتە خواییەن ئەرکی سەرەکیان بەرامبەر ئەو فیترەتە بریتییە لە سەرکوت نەکردنەوەی وسەرپشك کردنی لەهەڵبژاردنی ڕاستیەکاندا هەروەك چۆن ئیبراهیم کردی (عليه السلام)و گەیاندی بەڕاستیو ئامانج لەبەرئەوەی ئەم فیطرەتە پاکیو پاکژی تێدا هەڵدەقوڵێتو هەردەم بەلای ڕاستیو دروستی‌دا دەڕوات.

جێی ناخۆشحاڵییە.. کەکەسانێك هەن فیطرەتیان هەردەم هاواری ڕاستیان لێدەکاتو تینوی کانیاوی سازگاری بەرنامەی خواین، بەڵام خاوەنەکەی هەردەم سەرکوتی

دەکاتەوەو نایەڵێ ئەم نەمامە خواییە گەشە بکاتو خاوەنەکەشی لەژێر سێبەری فێنکیدا بحەوێتەوە، ئیتر زۆرجار لەبەر عەیبەیەو زۆرجار لەبەر زۆر تاوانکاری خاوەن فیطرەتەکەیەو زۆرجار هەر ئینکارییە لەگەڵ ئەو فیطرەتەدا.

ئێمەش دەڵێین:- ئەی ئەو بەندانەی کەخەڵاتی خوایتان لەگۆماوی تاوانو تاوانکاریدا خنکاندوە، ئەی ئەوانەی لەبەر شورەی چواردەورتان پێتان عەیبە ئەم فیطرەتە خزمەت بکەن، ئەی ئەوانەی کەتوشی بێهیوایبوون لەزۆر تاوان کاریتاندا، وەرن بۆلای کانیاوی سازگاری خوای ئەو فیطرەتە وشك بوەتان زیندویکەنەوە، وەرن لەگەرماوی خوایدا چڵكو پیسی چەندەها ساڵەی سەر فیطرەتتان لابدەن، وەرن لەژێر سێبەری سۆزی خوایدا عارەقی خەجاڵەتیتان بسڕن، مژدەبێ‌لێتان پەروەردگارتان بەسۆزە بەبەزەییە خودی خۆی دەفەرموێ ﴿كتب على نفسه الرحمة﴾ (الانعام: ) ..واتە: بەسۆزیو بەبەزەیی لەسەر خۆی واجب کردوە.

هەر خۆی جارێکیتریش مژدە دەداتو دەفەرموێت: ﴿ انى غفار لمن تاب وآمن وعمل صالحا ثم اهتدى﴾ واتە: من لێ خۆش بووم لەهەموو تاوانێك، بۆکەسێك کەپەشیمانی دەربڕیو باوەڕ بەئیسلام بهێنێو لەژیانیدا پەیڕەوی بکاتو کردەوەی باشە خوڕەوشتی بێتو پاشان بەردەوامیش بێ لەسەر ئەم خەسڵەتە جوانانە.

هەروەها جارێکیتر مژدە لەلایەن پێغەمبەرەوە (ﷺ) کەدەفەرموێت: ((لله اشد فرحا بتوبة عبده حين يتوب اليه من احدكم كان على راحلته بارض فلاة، فانفلتت منه وعليها طعامه وشرابه فأيس منها فأتى شجره فاضطجع فى ظلها، وقد ايس من راحلته، فبينما هو كذالك اذا هو بها، قائمه عنده، فأخذ بخطامها ثم قال من شدة الفرح اللهم انت عبدى وانا ربك، اخطاء من شده الفرح))(١)

واتە: خوای پەروەردگار خۆشحاڵترە بەتەوبەو گەڕانەوەی بەندەکەی بۆ سەر بەرنامەکەی، لەو کەسەی کەبەناو بیابانێکی وشكو برنگدا گوزەردەکات، لەشوێنێکدا لادەدات کەپشوییەك بدات، لەوکاتەدا حوشترەکەی لێبزردەبێت، کەخواردنو خواردنەوەکەشی لەسەرپشتی ئەو حوشترەیە، پاش گەڕان بەدوایدا نایدۆزێتەوەو دێت لەزۆر هیلاکیدا لەژێر دارێکدا ڕادەکشێو بێهیوای ڕووی تێدەکاتو چاوەڕوانی مردنە، ئالەم حاڵەدا دەبێت سەرهەڵدەبڕێت حوشترەکە لەبەردەمیدا وەستاوە، لەزۆر خۆشحاڵیدا

---

(١) رواه مسلم (٢٧٤٧).

هاوار دەكات دەڵێت ئەی پەروەردگارە تۆ بەندەی منو منیش خوای تۆم، لەزۆر خۆشحاڵیدا هەڵە دەكات، دەفەرموێ: خوای گەورە لەم پیاوە خۆشحاڵترە كاتێك بەندەیەك دەگەڕێتەوە بۆلای‌و پەیمانی ڕاستگۆی دەدات لەژیاندا.

دەی لەم مژدەیە خۆشترو لەبێژەرەكەی ڕاستگۆتر هەیە ئەی مرۆڤایەتی؟ باچیتر بیرو هۆشمان لەزنجیرەكانی نەفامی‌و بەرنامەی شەیتان ڕزگار بكەین‌و بەرێوەبەرایەتی كەسایەتیمان بدەینە دەست (ژیری)و تەرازوی ڕاستی پێوانە بێت لامان بۆ شتەكان.

**طوبى لمن كان عقله اميرا وهواه اسيرا....وويل لمن كان هواه اميرا وعقله اسيرا**

واتە: خۆشحاڵی بۆ كەسێك كەعەقڵ ئەمیری بێت‌و ئارەزوو ئەسیری بێت وەناخۆشی‌و نەگبەتی بۆ كەسێك كەئارەزوو ئەمیری بێت‌و عەقڵ ئەسیری بێت.

٥) پاك ڕاگرتنی ئەم فیطرەتەو پاراستنی لەپەردەی ڕەش تاوان‌و گوناح كاری بەتایبەتی، ئەو منداڵانەی كەهێشتا فیطرەتەكەیان پاك‌و بێگەردەو پەردەی ڕەشی تاوانی نەدراوە بەسەردا، پاراستنی ئەم فیطرەتە یان زۆر واجبێكی گەورەی دایك‌و باوك بەتایبەتی‌و چواردەوریشیان بەگشتی‌یە، چونكە هەموو لەدایك بوویەك كەدەبێت لەدایك لەسەر پاكی‌و فیطرەت دەبێت لەدایك(١) وبێگەردە لەتاوان‌و گونجاوە بۆ خوا، بەلام چواردەور كاریگەری سەرەكیان هەیە لەسەر ئەو فیطرەتە، ئەگەر هات‌و چواردەورەكە پاكژو فەرمان بەجێهێنەری خوابوون ئەوا فیطرەتی ئەم منداڵەش لەسەر ئەو پاكی‌یەی خۆی گەشەدەكات‌و سبەی دەبێتە دارێكی بەردار، بەلام ئەگەر بەپێچەوانەوە بوون ئەوا فیطرەتەكە پەردەی ڕەشی تاوانكاری دای دەپۆشێ‌و لەكۆتایدا دەبێتە میكرۆبێكی كوشندە بۆ چوار دەورەكەی.

نمونەش لەسەر ئەم دووشێوە چواردەورە زۆرن كەهەندێكیان بۆ بەلگە ڕوون دەكەینەوە بەپشتیوانی پەروەردگار:

أ) ئەو چوار دەورەی كەفیطرەت دەپارێزێ‌و گەشەی پێدەدات وەك ئەم بەسەرهاتەی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) كە (ابن عباس) خوای لێڕازیبێت دەفەرموێ: ـ ((شەوێكیان لەماڵی پورم (مەیمونە) خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) بووم بەمنداڵی ئەو شەوە هەر سەیری پێغەمبەرم دەكرد كەچۆن نوێژ دەكات، لەنیوەی شەودا هەستا بۆ نوێژی شەو، منیش

---

(١) بەبەڵگەی ئەو فەرمودەیەی كەدەفەرموێت: ((كل مولود يولد على الفطرة)).

هەرکە چاوم پێکەوت هەستام و چومەلای چەپیەوەو نوێژم دابەست، دەفەرمووێ پێغەمبەر پەلیگرتم و هێنامیە لای ڕاستی‌یەوە.[1]

بەڵێ.. فیطرەتی ئیبن عەباس لەناو ئەو چواردەورەدا پەروەردە بوو بۆیە بووە تەرجومانی قورئان، ئەو چوار دەورەو ئەو شەونوێژانە بوو ئەو کۆمەڵگەیەی ئەو سەردەمەی پێگەیاند کەمرۆڤایەتی هەتا ئێستا بەخۆیەوە نەدیووە. هەرکاتێ ئاواهی فیطرەت پارێزرا بەخۆیەوە دەبینێتەوە (ان شاالله)

ب) مندالّی مالکی کوڕی ئەنەس دووەم نمونەی پاك ڕاگتنی ئەو فیطرەتەیە کەبۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرموێ بەدایکمم گوت: دایکە دەچم زانیاری فێردەبم و دەنوسم.

دەڵێ دایکم وتی:- دەی باشە وەرە باجلێکی زانستت لەبەربکەم، دەفەرموێ: پاشان جلەکانی لەبەرکردم و پاشان کڵاو و عەمامەی لەسەرکردم و وتی: ئێستا بڕۆ بنووسە.

وەدایکم پێی ووتم:- بڕۆ بۆلای (ربیعە) لەپێشدا لەخووڕەوشتی فێرببە پاشان زانستەکەی.[2]

بەڵێ... دایکی مالك بەشێکی گەورە بوو لەوبنچینەیەی کەگەیاندیە پلەی (مجتهد)و زانای ئیسلام و هەرپاك ڕاگرتنی ئەو فیطرەتەش بوو گەورەو سەربەرزی پێبەخشی، ئیبراهیمیش ئەگەر خوای گەورە ئەو (رشد)ەی لەپێشدا پێنەبەخشرایە پیسی کۆمەڵگەکەیان دەگۆڕی و نەدەبوو ڕووناکی بۆ سەر زەوی.

ج) ئەو کۆمەڵگەیەی کەفیطرەت تێیدا سەرگەردان دەبێت و پەردەی ڕەشی تاوان دایدەپۆشێت وەك ئەو حاڵە دەبێت کەئێستا وولاتانی دوور لەخوای تێدا دەژی، لەوولاتێکی وەك ئەمریکادا کەنوقمی دوور لەخوایی و گومڕای و سەرلێشێواوی هاتووە لەلایەنی (مەعنەوی‌یەوە)، (٣٢) ملیۆن هاولاتی هێرش بەرن و خەتەردەخەنە سەر ژیانی خەڵکی، کە (٤٩٪) ئەم ژمارەیە تازە پێگەیشتوانی تەمەنی (١٦ - ٢٠) ساڵ دەبێت و ڕۆژانە ژیانیان لەسەر ئەم شێوە ڕەوشتە دەچێت بەڕێوە[3] ئەم مندالانە هەموویان پاکژو ڕاست و بێتاوان بوون کەهاتنە ژیانەوە بەلام لەچواردەورێکی پیس و دژ بەفیطرەت گەورەبوون بۆیە ئەمەیە ڕێڕەوی ژیانیان، جارێکی‌تر لەیەکێك لەوولاتان ئەم فیطرەتە تێك دەدرێت و خەوش و پیسی

(١) رواه مسلم/ التربيه النبوية للطفل/ امجد.(ص: ١٢٩).

(٢) التربية النبوية للطفل/ محمد بن نور عبدالحفيظ.

(٣) هل ستسقط امريكا؟/ ممدوح الزوبي/ (ص: ٨٣)

تێدەکرێت لەووڵاتی (بەریتانیا) (٧،١٪)ی منداڵان دەست درێژی (جنس)یان دەکرێتە سەر لەلایەن یەکێك لەئەندامانی خێزانیانەوە[(١)]

ژیان و پەروەریان بەم شێوەیەبۆیە لەدەریاکانی تاواندا مەلە دەکەن و ڕەشی گوناهکاری گەوهەری فیطرەتی داپۆشیون، هەر لەناو ئەم چوارچێوەیەدا گەورەش دەبن، تالەکۆتایدا دەبنە خۆرەی مرۆڤایەتی.

ئەمڕۆی کۆمەڵگەی موسڵمانانیش کەکەوتونەتە بەرهێرشی داگیرکەرانی فەرهەنگی و (سلوکی)، بەر لەهەموو شتانێك پێویستە لەهەوڵی پاراستنی ئەم فیطرەتەدا بن و نەهێڵن پەردەی تاوانکاری دایپۆشێ.

(٦) ئازیزان!! وانیەکی‌تر بۆ ئێمە لەم چیرۆکەدا بریتی‌یە لەگەیاندنی ڕۆشنای و ڕووناکی ئیمان لەپێش هەموو کەسدا بۆ خزمان و کەس‌وکاران هەروەك چۆن ئیبراهیم (علیه السلام) لەباوکی‌یەوە دەستی پێکردو هەوڵی‌دا کەلەتاریکی نەفامی ڕزگاری بکات، نەك بەسەر خزمان و کەس و کاراندا هەنگاو هەڵبنێت و خەڵکانێکی نەناس بخاتە پێشیانەوە، هەروەك خوای گەورە بەپێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ﴿وانذر عشيرتك الاقربين﴾

واتە: خزمان و دۆستانی نزیکت ئاگاداربکەرەوە لەپەروەردگاریان و ڕاستی. هەروەك لەشوێنێکی‌تردا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ووصينا الانسان بوالديه احسانا﴾ (الاحقاف: ١٥)

واتە: ئێمە ئامۆژگاری مرۆڤمان کردووە کەلەگەڵ دایك و باوکیدا چاکەکەرو چاك خوازبێت بۆیان، دەی باشترین و چاکترین چاکەکردن لەگەڵیاندا بریتی‌یە لەگەیاندنی ڕاستی و ڕۆشنی ئیمان پێیان، چونکە کاتێك ئیمان سەرمایەی هەر کەسێك بێت دەوڵەمەندی جیهانە.

هەروەك (ذی النون مصری) دەڵێ:- (العارف بالله تعالى لسير، وقلبه بصير، وعمله لله كثير) [(٢)]

واتە: ئەو کەسە کەبەتەواوەتی پەروەردگاری ناسی، بەڕاستی بەندەیە، وەدڵیشی بینەرە بەشتەکان، و کاریشی زۆرە بۆ پەروەردگار.

(٧) نەرم‌ونیانی لەکاری بانگ خوازیداو دووپەرێزی لەتوڕەی و قسە ڕەقی. هەروەك چۆن ئیبراهیم (علیه السلام) لەهەموو پێشەکیەکی ووتەکانیدا (ئەی باوکی شیرینم)ی تێدایەو هەوڵی نەرم کردنی دڵی بەرامبەر دەدات و دەیەوێت توێژاڵی، ڕەشی گوناهکاری لەسر فیطرەتەکەی لابدات،

---

(١) ڕۆژنامەی یەککرتوو، ژمارە (١٩٤)/ (ص: ٥)/ منداڵ لەبەردەم مەترسی کارپێکردندا/ طه حسن.

(٢) الاستعداد ليوم المعاد/ ابن حجر العسقلاني/ (ص: ٥٠).

کەبەڕاستی دەبێت ئەم جۆرە ڕەفتارە سیمای هەردەمی بانگخوازی ئەمڕۆ بێت لەم ڕابوونەدا، کەخوای گەورە دەیبات بەڕێوەوە، دەبێت بانگخوازان، وتە شیرین بن، دڵنەرم بن، هیوا دروست کەرین، ژێنەرین، موگناتیسی ڕاکێشانی دڵەکان بن، پاککەرەوەی توێژاڵی ڕەشی تاوان بن لەسەر دڵە خنکاوەکان، چونکە ئەم جۆرە ڕەوشتە بووکە ئیسلامی کردە کۆمەڵگەیەکی پتەو،تاکەکانی لەدەورکۆکردەوە، بانگخوازەکە پێغەمبەریش بێت هەردەبێت ووتە شیرین بێت.

ئەوە تاخوای گەورە هۆی گەشەسەندنی بانگی خوای ڕوون دەکاتەوە بۆ پێغەمبەری ئازیزو پێی دەفەرموێت: ﴿فبما رحمة من الله لنت لهم ولو كنت فظا غليظ القلب لانفضوا من حولك﴾ (ال عمران: ١٥٩).

واتە: بەهۆی بەسۆزی پەروەردگارەوە بوو نەرمونیانی تۆ بۆ ئەوان، کەزۆر نەرمونیان بوویت لەگەڵیاندا، گەربێت و قسەرەق و دڵ ڕەق بویتایە بەرامبەریان ئەوا لەچواردەورت کۆنەدەبوونەوەو بڵاوەیاندەکرد.

بەڵێ..ئەبێت بانگخواز بولای پەروەدگار گوفتار شیرین ورەفتار جوان بێت ، چونکە(رحمە) تی پێیە بۆ مرۆڤایەتی ،دەوری شوانێکی دڵسۆز دەبینێت بۆ ڕانەکەی ئەگەر بەسۆزی نەنوێنێ لەگەڵ بەندەکانی خوادا ئەوا زۆر ترسناکە چونکە ئەوزاتەی کەلەئاسمانە سۆزی نابێت بەرامبەری ،تەنها لەقورئاندا لە(١٨١)شوێنیجیاوازدا باس لە ووشەی (رحم) و داتاشراوەکانی کراوە.[1]

ئایا خوای گەورە بێهودە ئەم ژمارە زۆرە باس لێوەدەکات؟ نەخێر پاکو بێگەردی بۆ پەروەردگار، بەڵکو تەنها مەبەستی ئەوەیە کە بۆ ئێمەی بسەلمێنێ کەبەبەزەیی‌یەو ئێمەش بەسۆزبین لەگەڵ چواردەورماندا.

ئێمە ڕووناکیمان پێیە بۆ خەڵکی و خەڵکیش لەتاریکیدا نوقم بوون، ئایا ئەگەر لەناکاودا هێزێکی ڕووناکی زۆر بدەی لەدووچاووی کەسێك کەلەتاریکیەکی زۆردا بووە یەکسەر بەشەوارە ناکەوێت و خۆنادات بەم لاو لادا؟بێگومان هەروای لێدێت لەبەرئەوە پێویستە بەپلەپلەو لەسەرخۆی ئەو ڕووناکیە بگەیەنرێو وەك پەپولەی ڕەنگین لەدەوری ئەو شەمعەدا کۆبکرێنەوە.

---

(١) مفردات القرآن تفسير وبيان مع اسباب النزول للسوطي/فهرست الالفاض دار ارشد/ (ص: ٩٣).

لەلایەکی ترەوە ڕووەکەینە کاربەدەستان و پێیان دەڵێین بەبەزەیی بن لەگەڵ کۆمەڵگەیاندا، فەرمانیان پێکراوە کەوابن، وەك دایك بن بۆ ڕۆڵەکان و بەسۆزەو میهرەبان بن لەگەڵیاندا، چونکە ئەگەر وانەبن ،ئەوا لەلای زاتێك تاوانبار دەبن کەخاوەنی سزای ڕۆژێکی سامناکە، لەسەردەمی پێغەمبەری ڕاستگۆوە (علیه الصلاة والسلام) پێیان دەوترێت: (ان شر الرعاء الحطمة) [1]

واتە: خراپترین و ناشرینترین کاربەدەست، ئەوانەن کەدڵ ڕەق و بێبەزەییە لەگەڵ ژێر دەستەکانیدا.

وەمژدە دەدات بەو کاربەدەستانەی کەیەکسان خوازن و بەسۆزن بۆ ژێر دەستەکانیان و دەفەرموێت: ﴿ان المقسطين عندالله على منابر من نور يعدلون في حكمهم واهليهم وماولوا﴾ [2]

واتە: ـ ئەوانەی کەبەیەکسانی و دادپەروەری کاردەکەن لەلای خوای گەورە لەسەر مینبەری نورو ڕووناکین، ئەوانەی کەدادپەروەرن لەکاتی فەرمانداریتاندا، وەلەناو ماڵ و منداڵیانداو لەهەر شوێنێکدا بکرێن بەکاربەدەست.

(٨) وانەیەکیتر بۆ بانگخوازان، بریتییە لەچۆنیەتی (اسلوب)ی کاری ئیبراهیم (علیه السلام) لەبانك خوازیەکەیدا، ئەویش بریتییە لەدەرخستنی کەموکورتی پەیڕەوە کۆنەکەی بەرامبەر، بەشێوەیەکی پڕ لەحیکمەت و ژیری هەژێن.

نەك هەر یەکەم جار دەست بکەیت بەخستنەڕووی هەموو ئەو ڕاستیانەی کەلاتە، بەڵکو دەبێت بەشێوەیەکی پلەپلەیی ئاشکرای ئەو پەیڕەوەی پێشووی بۆ ڕوون بکاتەوە،و پاشان کارێکی گرنگتر لەوە بریتییە لەخستنەڕووی ئەو ڕاستیانەی کەلەلای بانگ خواز هەیە، ئەویش دەبێت بەحیکمەت، بزانێ چی لەکوێدا دەڵێ و کێ چی پێباشە، فلان بەچی گوێڕایەڵ دەبێت و فیسار بەچی خۆشحاڵ دەبێ، پێویستە لەدەرگایەکەوە بچێتە ژوورەوە کەژیری ئەو بەرامبەرە قبوڵی بکات، هەروەك ئیبراهیم (علیه السلام) لەگەڵ کۆمەڵگەکەیدا خوای پێدەناساندن.

نموونەیەك لەشێوەی ئەم بانگی خواییە باس دەکەین کەچۆن بەپێی تێگەیشتن و ڕادەی ڕۆشنبیری مرۆڤەکان لەگەڵیاندا دەدوێ. کاتێك دەبینین (خطاب)ی قورئانی

(١) رواه مسلم/ ١٨٢٠.

(٢) رواه مسلم/١٨٢٧.

دەیەوێت لەگەڵ عەرەبێکی دەشتەکیدا بدوێ. پێویستە لەدەرگایەکەوە بچێتە ناوەوە کەمێشکی وەری بگرێو گوێی بۆ رابگرێ، یاخود لەشتێکەوە دەست پێبکات کەجێی بایەخی ئەو بێت.

لەسورەی (الغاشیة)دا ئەم جۆرە دیاردەیە دەبینین لەبانگخوازێ کەخوای گەورە دەفەرموێت:و قسە لەگەڵ هەستو نەستی عەرەبێکی دەشتەکیدا دەکات. ﴿افلا ینظرون الی الابل کیف خلقت والی السماء کیف رفعت والی الجبال کیف نصبت والی الارض کیف سطحت﴾ (الغاشیة: ١٧ ـ ٢٠)

واتە: ئایا سەیری (حوشتر) ناکەن کەچۆن دروست کراوە، وەسەیری ئاسمانەکان ناکەن چۆن هەڵواسراوەو بەرزکراوەتەوە، وەسەیری شاخەکان ناکەن چۆن دامەزرێنراوە، وەسەیری زەوی ناکەن چۆن داخراوە وەك فەرش.

ئالێرەدا یەکەم دەرگای چونەژوورەوەی قسەکردن لەگەڵ ئەم عەرەبە دەشتەکیەدا، لەحوشترەکەیەوە دەست پێدەکات، چونکە تاکە شتێکی خۆشەویستو سەرنج ڕاکێشی ئەو حوشترەکەیەتی، چونکە هاتووچۆی بازرگانی پێدەکات بەوبیابانە گەرمانەدا، لەبەرئەوە خوای گەورە یەکەم سەرنجی بۆلای ئەو شتە ڕادەکێشێ کەئەعرابیەکە گرنگە بەلایەوە، پاشان هەر لەم دەرگایەوە بەرزی دەکاتەوە بۆ ئاسمانەکان،و ئینجا بۆ شاخەکان دەیهێنێتەوەو پاشان دەیخاتەو شوێنی خۆی کەسەر زەویەکەیەو لەسەری وەستاوە.

گەشتێکی (کەون)ی پێدەکات چونکە زانیویەتی لەکام دەرگاوە قسەی لەگەڵدا دەکات، وەپێغەمبەری ئازیز دەفەرموێت: (ئێمەی پێغەمبەران فەرمانمان پێکراوە کەلەگەڵ خەڵکیدا بدوێین بەپێی بەرزونزمی ژیریان.

(٩) خاڵێکیتر لەوانەکانی ئەم بەندە بریتییە لەوەی کەپێویستە لەسەر بەسەلاچوویەکی نەزان دوای زانایەکی بچوك بکەوێت هەرچەندە نەزانەکە گەورەبێتو زاناکەش بچووك بێت، چونکە ئەوە تائیبراهیم (علیە السلام) داوا لەباوکی دەکات کەدوای بکەوێتو پێشی دەفەرموێت: ئەوەی کەمن دەیزانم تۆ نایزانی ﴿یاابتِ انی قد جائني من العلم مالم یأتك فاتبعني اهدك صراطاً سویا﴾ (مریم: ٤٣)

مامۆستای (علامە) دکتۆر (یوسف القرضاوی) لەبارەی ئەم ئایەتەوە دەڵێ: (واجب علی الجاهل ان یتبع العالم ولوکان اصغر منه) [1]

---

(١) ثقافة الداعیة/ د.یوسف القرضاوی/ (ص: ٣٠).

واتە: پێویستە لەسەر نەزان دواکەوتەی زانابێت ئەگەر بێتو بچووك تریش بێ.

وەپێویستیشە لەسەر زانای بچووك ڕێزی نەزانی گەورە بگرێتو جوان ڕەفتاربێت لەگەڵیدا هەروەك ئەو جوان ڕەفتاریەی کەئیبراهیم لەگەڵ باوکیدا ئەینواند، لەبەرئەوەی ڕێزگرتنی ریش سپیان واجبێکی بەلگەنەویستە هەروەك پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) دەفەرموێت: ((ان من اجلال الله تعالى اكرام ذى الشيبه المسلم))

واتە: ڕێزگرتن لەخوای گەورەو بەگەورە دانانی لەڕێزگرتنو خزمەت کردنی پیاوی پیردا دەردەکەوێت، واتە کاتێك ڕێزت لەو ریش سپیەنا ئەوا ڕێزی خودات پاراستووە، چونکە ریش سپی لای پەروەردگار قورسایی تایبەتی هەیە.

بەتایبەتی (دایكو باوك)... کەبەڕاستی ڕێزیان هەرگیز کۆتایی نایەتو خزمەت کردنیان لەهەموو کاتو شوێنێکدا پێویستە، نابێتو هیچ ڕاست نیە، کەمنداڵ ئەم ڕێزە نەهێڵێت، بەتایبەتی ئێستای تازە پێگەیشتووانی ڕابوونی ئیسلامی دەبێت زۆر ئاگاداربن، بەکەمێك زانستەوە نەچن بەگژ دایكو باوكو خزمانیانداو ئیتر وابزانێ تەنها ئەو دەیزانێ!!

نەخێر ڕووخاندنی هەموو کێوەکان بۆ خوای گەورە بەقەد ڕازیبوونی دایكو باوك نیە لەپاداشتدا، چونکە خوای گەورە پەرستنی خۆیو چاکەکردن لەگەڵ دایكو باوکدار بەیەکەوە داناوە هەروەك دەفەرموێت: ﴿وقضى ربك الاتعبدوا الا اياه وبالوالدين احسانا اما يبلغن عندك اكبر احدهما او كلاهما فلا تقل لهما اف ولاتنهرهما وقل لهما قولا كريما، واخفض لهما جناح الذل من الرحمة وقل رب ارحمهما كما ربياني صغيرا﴾ (الاسراء: ٢٣ - ٢٤)

واتە: پەروەردگارت وای بڕیارداوە کەتەنها ئەو بپەرستن، پاشان لەگەڵ دایكو باوکتاندا زۆر بەباشەو چاکە بجووڵێنەوە، کاتێك کەدەگەنە تەمەنێکی گەورەو پیری یەکێکیان بێت یان هەردووکیان خزمەت کاریان بنو فەرمانەکانیان بەجێبهێننو هەرگیز نارەزاییو بێتاقەتی دەرنەبڕن بەرامبەریان پێیان نەڵێن (ئۆف)و قسانێك نەکەن کەببێتە هۆی هەست بریندارکردنیان یاخود بەگوێنەکردنی فەرمانیان، وەهەردەم هەتا لەدوونیادا لای تۆن ووتەی جوانو شیرینو بەڕێزیان لەگەڵدا بەکاربهێنە، وەخۆ بەکەم گریە لەئاستیانداو نەرمو نیان بەلەگەڵیاندا، وەبڵێ ئەی پەروەردگارە بەسۆزو بەخشندەبە لەگەڵیاندا، هەروەك چۆن ئەوان بەسۆز پێگەیەنەری من بوون بەمنداڵی.

نموونەش لەسەر زانایی بچووكو نەزانی گەورە لەسەردەمی خەلیفەكانی ڕاشیدین دا ڕووی داوە كەبۆ زیاتر ڕوون بوونەوە باسی لێوە دەكەین، هەرچەندە پیاوە گەورەكان هاوەڵی پێغەمبەریش بن ڕۆژگار، منداڵێك زاناترە.

(ابن عباس) (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە: (كان عمر يدخلني مع اشياخ بدر. فقال لـه عبدالرحمن بن عوف: لم تدخل هذا الفتى معنا؟ ولنا ابناء مثله؟ فقال: انه ممن قد علمتم، فدعاهم ذات يوم ودعاني ومارأيته دعاني يومئذ الا ليي بهم مني، فقال: ماتقولون في قوله تعالى: ﴿اذا جاء نصر الله والفتح ورأيت الناس يدخلون في الدين الله افواجا، فسبح بحمد ربك واستغفره انه كان توابا﴾، حتى ختم السورة فقال بعضهم امرنا الله ان نحمده ونستغفره اذاجاء نصرالله والفتح علينا، وقال بعضهم: لاندري وبعضهم لم يقل شيئاً، فقال لي ياابن عباس: كذالك تقول؟ قلت لا، قال: فما تقول؟ قلت: هو أجل رسول الله (ﷺ) اعلمه الله اذاجاء نصرالله والفتح ورأيت الناس يدخلون والفتح فتح مكة فذالك علامة اجلك فسبح بحمد ربك واستغفره، انه كان توابا، فقال عمر: ماعلم فها الا ماتعلم) [1]

واتە: ئیبن عباس (ڕەزای خوای لێبێ) بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: (لەمنداڵیمدا ئیمامی (عمر) دەیبردمە لای پیاو ماقوڵانی كۆچكەرانو لەكۆڕو كۆبونەوەیاندا دایدەنیشانم، جارێك (عبدالرحمن كوڕی عەوف) بەئیمامی عومەری ووت: ـ بۆچی ئەم منداڵە دادەنیشێنیت لەگەڵماندا؟ لەكاتێكدا ئێمە منداڵی وەك ئەومان هەیە؟

ئیمامی عومەر فەرمووی: ئەمە لەوانەیەكە.. دەیان ناسم وناسروان بەرێزو زانیاری.

ابن عباس دەفەرمووێ: ـ پاشان ڕۆژێك منی بانگ كرد تەنها بۆئەوەی بانگ كردم كەپیشانی ئەوانم بدات.

پاشان ئیمام لەپیاو ماقوڵانی كۆچ كەرانی پرسی ئێوە دەڵێن چیو چۆن تێدەگەن لەوفەرموودەیەی خوای گەورە كەدەفەرموێت: ﴿اذا جاء نصرالله والفتح...﴾ تاكۆتایی سورەتەكە، دەڵێت:: هەندێكیان ووتیان: ـ (خوای گەورە فەرمانی پێكردووین كەسوپاس گوزاری بكەینو داوای لێخۆش بوونی لێبكەین، كاتێك كەسەركەوتنی خوای دەستەبەربوو بەرنامەی خوایی فراوان بوو.

(١) رواه ابن سعد ابن جرير وابن المنذر/ التربيه النبويه للطفل/ افجاد/ محمد نور بن عبدالحفيض سويد/ (ص: ١٢٤).

هەندێکی تریان وتیان: نازانین مانای چی‌یە، وەهەندێکی تریشیان لەو پیاوە کۆچکەرانەی لەوکاتەدا ئامادەبوون، هیچیان نەووت./

ابن عباس (خوای لێڕازی‌بێت) دەفەرموێت: پاشان ئیمامی عمر ڕووی وەرچەرخان بەلای منداو ووتی ئەی (ابن عباس) تۆ دەڵێ‌ی‌چی لەبارەی ئەم فەرموودەیەی خوای گەورە دەفەرمووی: منیش وتم: مانای ئەم فەرموودەیەی پەروەردگار بریتی‌یە لەهاتنی (ئەجەل)ی پێغەمبەر (ﷺ)و مردنی‌و دنیا جێ‌هێشتنی، خوای گەورە زانیاری کردو پێ‌ی فەرمووە کاتێك کەدینی خوای گەورە سەرکەوتنی بەخۆوە بینی‌و بەرفراوان بوو، فەتحی مەککە کرا ئەوا ئەوکاتە نزیکی مردنتەو سوپاس گوزاری پەروەردگارت بکە لەسەر ئەو سەرکەوتنەو داوای لێخۆش بونی لێبکە، چونکە بەڕاستی پەروەردگار لێبووردەیە.

ابن عباس وەفەرمووی: ـ پاش ئەوەی کەئەم وەڵامەم تەواوکرد ئیمامی عمر فەرمووی منیش هەرئەوەندەی لێدەزانم کەتۆ لێ‌ی دەزانی ئەی (ابن عباس).

خوێنەری ئازیز ئەمەش بەڵگەیە لەسەرئەوەی کەزۆرجار بچووکەکان لەگەورەکان زاناترن، هەروەك خوای گەورە خۆی دەفەرمووێ: ﴿يؤت الحكمة من يشأ ومن يؤت الحكمة فقدأوتي خيرا كثيرا﴾

واتە:ـ خوای گەورەو زانست دار، دانایی‌و زانیاری‌و بەسەلیقەی دەدات بەهەرکەس کەخۆی بیەوێت، وەبەڕاستی هەرکەس ئەم شتانەی پێ‌بەخشرا ئەوا چاکە خێرو بێرێکی زۆری دەستگیربووە.

# بەندی سێهەم

## وەڵامی کۆمەڵگەی بانگ کراو بۆ بانگ خوازی خوایی

خوێنەری ئازیز.. جارێکیتر گلێنەی چاوەکانت دەخەینەوە سەر بەسەرهاتەکانی ژیانە پڕ لەپەندو ئامۆژگاریەکەی (ئیبراهیم) (علیـه السـلام)و دەچینەوە خزمەتی ئەو کەشتیەی کەبەناو دەریاکانی مێژووی پێغەمبەراندا گەشتمان پێدەکاتو دەمانکاتە مێژوو ناسێکی بەسەرهاتەکانی بانگی خوایی لەسەر زەویدا.

پاش ئەوەی کەباسمان لەوەکرد کەچۆن ئیبراهیم (علیـه السـلام) بیروبیاوەڕی کۆمەڵگەکەی پووچەڵ کردەوەو خوای ڕاستەقینەی پێناساندن، ئێستا باس لەوەڵامی ئەو کۆمەڵگە بانگ کراوە دەکەین بۆ ئیبراهیم (علیه السلام). بۆ ئەم مەبەستە دەچینە خزمەت قورئانی پیرۆزو لاپەڕە بەحیکمەتو ڕاستیەکانی هەڵدەدەینەوەو گوێڕایەڵی ڕاستکۆترین ووشە دەبین لەهەموو بوونەوەردا.

خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا لەبارەی وەڵامی باوکی ئیبراهیم دا دەفەرموێت:
﴿قال اراغب انت عن الهتي ياابراهيم، لئن لم تنته لارجمنك واهجرني مليا﴾ (مريم:٤٦)

واتە: پاش ئەوەی کەئیبراهیم باوکی بانگ کرد بۆ یەکتاپەرستی، باوکی ووتی: ئایا تۆ پشتت لەخواکانی من هەڵکردووەو بانگم دەکەی بۆلای خوایەکی تاکو تەنها؟!

ئەگەر هەتا زووە واز لەم قسانە نەهێنیت ئەوا بەردبارانت دەکەمو لەخۆشەویستانم دەردەچیت، وەبەجێم بهێڵەو لاچۆ لەلام بەجێهێشتنێکی زۆرخایەن.

هەروەها خوای گەورە لەبارەی وەڵامی گەلەکەیەوە دەفەرموێت: ﴿وحاجه قومه﴾

واتە: پاش ئەوەی کەئیبراهیم بانگی کۆمەڵگەکەی کرد بۆلای پەروەردگاری تاکو تەنها، کۆمەڵگە دژی وەستانو (مجادلە)ی نەبوونی یەك خوای تاكو تەنهایان دەکردو دەیان ترسان بەوەی کەخواکانیان دەستی لێدەوەشێنن ئەگەر بێتو پەشیمان نەبێتەوە.

هەروەها لەجێگەیەکی تر لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێ: ﴿فما كان جواب قومه الا ان قالوا اقتلوه أو حرقوه﴾ (العنكبوت: ٢٤)

واتە: کۆمەڵگەی ئیبراهیم هەموو وەڵامەکەیان ئەوەبوو کەووتیان: بیکوژن یان بیسووتێنن.

بەڵێ... لەیاداشتی ئەو هەموو بانگ خوازیە جوانەدا، ئەو ووتە شیرینانەدا، ئەمە وەلامەکەیان بوو، هەردەم دوژمنانی پەیڕەوە خوایەکان دڵوگوێو هەستو نەستیان بەم شێوەیە بەستراوەو ڕاستی وەرناگرێو چاویان کوێرە لەئاستی پرشنگداری ڕۆژدا.

ئەمڕۆش خەڵکانێك هەن کەبانگ دەکرێن بۆ سەر ڕێگەی خوایی‌و داوای ئەوەیان لێدەکرێ کەڕاستی بکەنە پێشڕەوی ژیانیان، بەلام مە خابن، یان بەهیچ جۆرێك وەلامی ئەم بانگی خواییەیە ناداتەوە یاخود بەهەموو توانایەکی دژایەتی دەکاتو ئازاری بانگ خوازان دەدات، کەبەڕاستی ئەگەر ئەم جۆرە کەسانە تەنها تۆزێك بیر لەخۆیان بکەنەوەو بەچاوی (وویژدان) سەیری خۆیان بکەن، ئەوا تاوانباری خۆیانیان لەلوتکەدا بۆ دەردەکەوێت.

## نیازی خراپی ئیبراهیم (عليه السلام) بەرامبەر بتەکان

پاش ئەوەی کەباوکی‌و کۆمەڵگەکەی بەم شێوەیە پڕ لەڕەقی‌و ناشرینەوە وەلامیان دایەوە، زۆر نیگەرانی ئیبراهیمی (عليه السلام) داگرتو لەبیرکردنەوەی گرتنەبەری ڕێگەیەکی‌تردا بوو، بۆ گەیاندنی ئەم ڕووناکی‌یە خواییەو پڕکردنەوەی تاریکەکانی نەفامی پێ‌ی، هەروەك چۆن ئەمڕۆ بانگخوازە خوێنگەرمەکانی ئیسلام دەیکەن بۆ ڕزگارکردنی خەڵکی لەتاریکی‌ونەزانی‌و نەفامی.

ئەمجارەیان ئیبراهیم (عليه السلام) ڕێگەی شکاندن‌و لەناوبردنی بتەکانی گرتەبەر،و ویستی بڕینەکە لەبنچینەوە چارەسەر بکاتو ئەو بتانەی کەبوونەتە جێ‌ی گومڕایی خەڵکی بشکێن‌و بێ‌سوودو بێ‌زیانی دەربکەوێت بۆ خەڵکی هەروەك ڕاسگۆترین ووتەکان کە(قورئانی پیرۆزە) ئاماژە بۆ ئەم ڕووداوە دەکاتو دەفەرموێت: ﴿فنظر نظرة في النجوم* فقال اني سقيم* فتولوا عنه مدبرين* فراغ الى الهتهم فقال الا تأكلون* مالكم لاتنطقون* فراغ عليهم ضربا باليمين﴾ (الصافات: ٨٨ ـ ٩٣)

واتە: پاش ئەوەی کەئیبراهیم سەیری ئەستێرەکانی کرد بۆ ئەوەی بەتەواوەتی بۆی دەربکەوێت کەئەمانە خوانین‌و بۆشی ڕوون بۆوە[1] بەباوك‌و خەڵکی کۆمەڵگەکەی کەدەچوون بۆ جەژنێك کەهەیان بوو، لەم جەژنەدا خەڵکی دەچوونە دەرەوەی شار بۆ

---

(١) لەڕاڤەی ئەم (دەقە)دا خاوەنی تفسیری (مقتطف) د.مصطفى خرم دل.

دەفەرمووێ: (النظرة التي نظرها ابراهيم في النجوم، هما اشار اليه سبحان في) (الانعام: ٧٥ -٧٦)

واتە: ئەو بەسەرهاتە کەلەسورەی (الانعام) خوای گەورە باسی دەکات.

سەیران، بەئیبراهیمیان ووت کەوەرە لەگەڵماندا، بەلام ئیبراهیم فەرمووی: من نەخۆشم و نایەم لەگەڵتاندا بۆ ئەم سەیرانە، پاشان خەڵکەکە بەجێیان هێشت و ڕۆیشتن بۆ سەیران، پاشان کەخەڵکەکە ڕۆیشتن (ئیبراهیم) (علیه السلام) ڕۆیشت بۆلای بتە دەستکردەکانیان و چەند خواردنێکی بۆ بردن و پێی ووتن: ئەوە چیە ئەڵێی ناخۆن ئەم خواردنە؟ بەگاڵتە پێکردنەوە، ئەوە چیە نابیستم هیچ ووتەیەك بدرکێنن بەچاك و بەخراپ، پاشان لەداخاندا بەدەستی ڕاستی پیایدا کێشان و شکاندنی.

بەڵی.. بانگ خوازی خوایی خەمخۆری کۆمەڵگەکەیەتی بۆیە بەجۆشەوە بۆ لەناوبردنی ئەو شتەی کەبەرۆ دۆزەخیان دەبات و سەرگەردانی دونیاو دوارۆژیشیان دەکات.

وە لەمەنزلێکیتر لەقورئاندا ئەم بەسەرهاتە ئاماژە پێدەکات و دەفەرموێت: ﴿وتالله لأكيدن اصنامكم بعد ان تولوا مدبرين* فجعلهم جذ اذا الا كبيراً لعلهم اليه يرجعون﴾ (الانبياء: ٥٧ ـ ٥٩)

واتە: سوێند بەخوای گەورە ئەبێت کارێکی وابکەم بەبتەکانتان،و وایان لێبەسەربهێنم، کە بێ سوودی و بێزیانی یان دەربکەوێت پاش ئەوەی کەڕۆیشتن هەموو بتەکانی شکاندو پارچە پارچەی کردن تەنها گەورەکەیان نەبێت، بۆئەوەی بگەڕێنەوەو لێی بپرسن کەکێ وای لێکردوون ووەلامیان بداتەوە، کەهەرگیز توانای وەلام دانەوەی نیە.

ابن کثیر لەڕافەی ئەم فەرموودەدا دەفەرموێت:ـ (ثم اقسم الخليل قسما اسمعه بعض قومه ليكيدن اصنامهم، اى إني ليحرصن على أذاهم وتكسيرهم بعد ان يولوا مدبرين، اى انى عيدهم، وكان لهم عيد يخرجون اليه) (١)

واتە: پاشان ئیبراهیم (علیه السلام) سوێندی خوارد، کەکۆمەڵێك لەخەڵکی گوێبیستی ئەو سوێندەبوون کەبەنیازی زیان گەیاندن بەبتەکانیان خواردی، یاخود سووردەبێت لەسەر زیان پێگەیاندنیان و شکاندنیان پاش ئەوەی کەڕوویان وەرگێڕا، یاخود پاش ئەوەی کەڕۆیشتن بۆ جەژنەکەیان، کەجەژنێکیان هەبوو دەچوونە دەرەوە بۆی بەمەبەستی سەیران.

ئەمەیە ئەو بانگخوازە گەورەی کەدڵسۆزی بۆ خوا لەکارەکانیدا خۆیان دەنوێنن و ڕاستی پەیمان بەستنی نێوان خۆی و خوا دەردەخات، هەڵدەستێت بەگەیاندنی ڕووناکییە ڕۆشن کەرەکان بۆ تاریکیە بەرچاوو ڕەشکەرەکان.

---

(١) تفسير القرآن العضيم/ابن كثير/ج٣/(ص: ١٧٣)/طبعة محققة/دار اليوسف.

ئەوەندە خەمخۆرە دەبێتە پزیشـك لـەو پزیشـکانەی کـەکاتێك نەخۆشـی نەخۆشـەکان تیماردەکات، وای تیمار دەکات کەجارێکیتر سەرهەڵنەداتەوەو بنەبڕیبکات، هـەروەك چۆن ئـەم بـەڕێزە هەڵدەستێت بەبنـەبڕکردنی ئـەو هۆیـەی کەئـەم کۆمەڵگەیـەی بـەم شـێوەیـە گومڕاکردووە، کەئەویش بتەکانن.

(سید قطب) لەڕاڤەی ئەم فەرموودەیەدا دەفەرمووێ: (وتحولت الالهة المعبودة الى قطع صغيرة من الحجارة والاخشاب المهمشة) [1]

واتە: ئەو خوایەی کەدەیان پەرستو کڕنووشیان بۆ دەبـراو بەگـەورە دەگـیرات. بـووە چەند پارچەیەك چەند بەشێکی بچووك لەبـەردو تەختـەی بێسوود. لەهـەموو سـەردەمێكو لەهـەموو کـاتێکدا ئـەم خـوا دەسـتکردانە ئەمـە حاڵیـان بـووەو هـەرگیز لەبـەردەم ڕاسـتیو ڕۆشـنیدا خۆیـان پێنـەگیراوە، بانەگـەر بێـتو مرۆڤیـش بـن، چـەندەهای وەك (فیرعـەونو نەمروود)بن هەر لەناودەچن، هەر دەرووخێنرمانەوەی هـەتا هـەتای بـۆ نێـوە نیـە، ئەوانـەی کەدژایەتی بانگخوازانی خوایی دەکەن، چاك بزانن بەڵێنی خواییـە کـەڕۆژێك هـەر دەشـکێن وەك بتەکانی ئیبراهیم، هەر لەناودەچن ئەگەر لەسەر ئەو حاڵە بەردەوام بن.

ڕۆژێکی زۆر گەورەبوو لەمێژووی کۆمەڵگەی ئیبراهیمدا (علیه السلام) بـەڵکو لـەمێژووی مرۆڤایەتیدا، وەرچەرخانێك بـوو کەلەلاپـەڕە زەردەکـانی مێـژوودا درێـژە بەمانـەوەی خـۆی دەدات، یەکەم هەنگاوی ڕزگاربوون بوو لـەکۆتی نـەفامیو نـەزانی، برینـی یەکـەم پلیکانـەی بەمرۆڤ بوون بوو، لابردنی پەردەیەکی ڕەشی ئەسـتوور بـوو لەسـەر چـاوە کوێرکراوەکـان، هەر ئەو ڕووناکیەیە کە ئـەمڕۆی ئێمـەی مرۆڤایـەتیش لەسـەری دەڕۆیـنو پیـادەی دەکـەین [2] خۆمانی پێڕزگـار دەکـەین لەتاریکـەکان، ئیسـلام، ئـەو ئیسـلامەی کەمرۆڤـەکان دەخاتـەوە ڕیزی مرۆڤایەتی، ئەو پرۆگرامەی کەلەوەچەی ئیبراهیم (علیه السلام) خوای گـەورە (محمد) (ﷺ) ی بۆ هەڵبژارد.

---

(١) في ظلال القران/سيد قطب/ج٥/(ص: ٥٤٥)/بيروت ـ لبنان.

(٢) تفسير الكبير/ الامام مخرالدين الرازي/ ج ٢١ ـ ٢٢

## ڕووبەڕووبونەوەی ئیبراهیم (علیه السلام)لەگەڵ کۆمەڵگەکەیدا

پاش شکاندنی بتەکان لەلایەن ئیبراهیمەوە (علیە السلام)، و هێشتنەوەی تەنها گەورەکەیان، کاتی ئەوە هات کەخەڵکی لەسەیرانەکەیان بێنەوەو بگەڕێنەوە سەرماڵو حاڵو بتەکانیان، بەلام کاتێك دێنەوە چی ببینن؟! سەیردەکەن واهەموو بتەکان شکێنراون و پارچە پارچەبوون و هیچیان بەسەر هیچەوە نەماوەو تەنها بتەگەورەکە نەبێت وەك خۆی ماوەتەیەوەو تەورێکیش بەسەر شانیەوەتی.(١)

بەم ڕوودلوە سەرسام دەبنو زۆر بەناناسایی دێتە بەرچاوویانو مێشکیان وەری ناگرێ.

قورئانی پیرۆز لەبارەی ئەم بەشەوە ئاماژە دەکاتو هەستمان ڕادەکێشێو دەفەرمووێ: ﴿قالوا من فعل هذا بالهتنا انه لمن الضالمين*قالوا سمعنا فتى يذكرهم يقال له ابراهيم* قالوا فأتوبه على اعين الناس لعلهم يشهدون*قالوا انت فعلت هذا بألهتنا ياابراهيم* قال بل فعله كبيرهم هذا فسئلوهم ان كانوا ينطقون*فرجعوا الى انفسهم فقالوا انكم انتم الضالمون*ثم نكسوا على رؤسهم لقد علمت ماهؤلاء ينطقون*قال افتعبدون من دون الله مالاينفعكم شيئا ولايضركم*اف لكم ولما تعبدون من دون الله افلا تعقلون*قالوا حرقوه وانصروا ألهتكم ان كنتم فاعلين﴾ (الانبياء: ٥٨ ـ ٦٨)

واتە: پاش ئەوەی کەگەڕانەوە لەسەیرانەکەیانو ئەم بەسەرهاتەیان بینی ووتیان بەتوڕەبوونو سەرسوڕماویەکەوە: ئەوە کێوای بەم خوایانەی ئێمە کردووە؟

ئالێرەدا ئەو کۆمەڵەی کەگوێبیستی ئیبراهیم بوون لەوکاتەدا کەسوێندی خواردەبێ زیانیان پێبگەیەنێ ووتیان: بیستوومانە لاوێك بەخراپە ناویان دەباتو ڕەخنەیان لێدەگرێت کەناوی (ئیبراهیم)ە.

پاش ئەوەی کەهێنایان ووتیان: ـ ئایا تۆ ئەم کارەت کردووە بەپەرستراوەکانمان ئەی ئیبراهیم؟

ئیبراهیم: نەخێر من ئەم کردووە، بەڵکو ئەم بتە گەورەیەیان وای لێکردوون.

دەی پرسیاری لێبکەن ئەگەر ئەمانە خوانو قسەدەکەن، تابۆتان ڕوون بکاتەوە کەکێ ئەوەی بەسەر هێناون؟

کەئەم قسەیان لەئیبراهیم بیست، گەڕانەوە بۆ ژیریو عەقڵی خۆیانو بیریان کەوتەوە

---

(١) تفسير الكبير/للامام مخرالدين الرازى/ج ٢١ ـ ٢٢

کەشتێك نـەتوانێ قسـەبکاتو ببیستێ چۆن هـەڵدەبژێرێ بـەخوا؟!! لـێرەدا کۆمـەڵێکیان بەوانیتریان ووت ئیبراهیم ستەم کارنیە بەڵکو ئێوە ستەمکارن کەئەم شتە بێگیانانە دەپەرستن.

پاشان بەتۆزێك یەکسەر سەرەو ژێربوونەوە بۆ بارە چەوتەکەی خۆیانو گەڕانەوە سـەر بیروبـاوەڕە چەوتـەکانو ووتیـان: بێگومـان تـۆ زانیوتـەو ئـەزانی کەئەمانـە گفتوگۆ ناکـەن، کەواتە چۆن پێمان دەڵێیت پرسیاریان لێبکەن؟

ئـالێرەدا ئیـبراهیم بەتووڕەیی‌یـەوە ووتـی: ئایـا جگـە لـەخوای گـەورە شـتانێکی ئـاوا دەپـەرستن کەهیچ قازانجو زیانێکتان لێنادەن ؟ بێتاقـەتیو (ئـۆف) بـۆ ئێـوەو ئەوانەش کەدەیپەرستن لەباتی خوا، ئایا بیرناکەنەوە؟ژیرنابن کەچ کارێکی بێمانا دەکەن؟

خەڵکەکەش لەوەڵامی ئەم گوفتارەی ئیبراهیم دا ووتیـان: بیسووتێنن لەپاداشـتی ئـەم کـارەیداو ئـاگری بـۆ بکەنـەوە،و خواکـەتان سـەرخەن بەسـەریدا بـەهۆی ئـەم ئـازارەوە کەدەیدەن، مانای بەم شتە بەتوانایی خواکەتان دەرخەن، ئەگـەر ئەتانـەوێتو شتێك بکـەن کەخواکەتان سەربکەوێت.

بـەڵێ.. ئـازیزان پاداشـتی ئـەم بانگخوازیی‌یـە بـەم شێوەیە بوو لەلایـەن خـەڵکی ئـەو سەردەمەوە، هاتبوو تاریکیەکانی ڕێگەیان بۆ ڕۆشن بکاتەوە، بـەڵام ئـەمان لەگـەڵ خۆیـاندا دەیانوویست نوقمی تاریکی‌یـەکانی بکـەن، دەیوویسـت بیروهۆشیان بـۆ بگێڕێتـەوە، بـەڵام ئەمان زیاتر خۆیان بێهۆش دەکرد.

ئەم جۆرە مرۆڤانە بریتین لەو دڵانەی کەخوای گەورە پێیان دەفەرمووێت:

﴿ ثمَ قست قوبكم من بعد ذلك فهي كالحجارة أو أشد قسوة ﴾(البقرة : ٧٤)

واتە: پاشان دڵکانتـان ڕەق بـوو هـەروەك (بـەرد) بـەڵکو ڕەقترو بێکەڵك تریش، ئـەم جۆرانـە لەهـەموو سـەردەمێکدا هـەن، دیـواری ئەسـتووری بـەردەم ڕووناکیـەکانن، ئەمانـە خراپترین کەسانێکی سەرزەوین لەهـەموو سـەردەمەکاندا هـەن، لەگـەڵ هـەموو بـانگخوازاندا هەن، لەهەرکاتو لەهەر شوێنێکیشدا بێت، هەروەك لەگەڵ ئێستای بانگ خوازانـی ئیسـلامدا هەن، بەهەموو شێوەکان ڕووبەڕوویان دەبنەوە ڕێگریان لێدەکەن.

ئەمانە بێهۆشن، زۆر بێئاگان، بەڵکو نووستوون، چونکە ئەم ڕووناکی خوایی‌یە ئەوان ناتوانن ڕێگری‌بـن، نـاتوانن لەبـەردەم ویسـتی پـەروەردگاردا بووەسـتن، خـوای گـەورە وەك ئەوانە مرۆڤ نیە، خوا ئەو خوایەیە کـە فەرمانـەکانی لـەنێوان پیتـی (ك - ن) (كن) هـەرکات فەرمووی (ببە) یەکسەر هەموو شتەکان دەبێ، خوای گەورە ئەو خوایەیە کە (موسا)ی علیـە السـلام لـەماڵی (فیرعـەون)دا گۆشت کـرد، (یوسـف)ی لـەناو بیرەوەخستە سـەر کورسـی

پاشای، لەبەرئەوە با ئەم ڕێگرانە بزانن چاك، کەناتوانن بەریەست بن لەبەردەم بانگخوازی خوایدا، هەرچییان لەگەڵدا بکەن، تازە ئەمپەیامە مل دەنێ‌و وەستانی بۆنیە.

جارێکیتر قورئان لەم بارەیەوە دەفەرمووێت: ﴿فما كان جواب قومه الا ان قالوا اقتلوه أو حرقوه﴾ (العنكبوت: ٢٤)

واتە: گەلەکەی ئیبراهیم ووتیان: بیکوژن بەشمشێر یان هەر شتێك کەگیانی دەربکات یان بیسوتێنن بەئاگر.[1]

ئەمانە هەردەم وابێئاگابوون لەشتەکان، وادەزانن کەئەگەر بێت‌و ئەمانە هێرشی بۆبەرن‌و ئازاری بدەن ئەوا ئیتر ئەو پەیامە لەڕێکردن دەوەستێ.

نەخێر.. هەرگیز وانیە زۆر بەپێچەوانەوە ئەم پەیامە کام کات سەربازەکانی ئەشکەنجەیان زیاتر چێشت ئەوا ئەو وەختە زیاتر سەرکەوتنی خوایی یان بۆ دێت هەروەك مامۆستایە بەڕێز فەرمووی: (ئەم ڕێگەیەی ئێمە دووره ئێمەش وایـن لەناو ئۆتۆمبیلەکەیدا، ئەگەر بێت‌و جاروبار بەرزی‌و نزمیەك نەیەتە سەر ڕێگامان ئەوا خەومان لێدەکەوێت).[2]

ئەبێت ئەم ئازاردان‌و تاقیکردنەوە هەبێت بۆئەوەی پاداشتی ڕاستگۆکان هەردەم لەزیادبووندا بێت‌و سزای خراپەکارانیش هەردەم لەگەورەبووندا بێت‌و ببێتە بارێکی قورس‌و گران بەسەر کۆڵیانەوە بۆ ڕۆژگارێك کەمنداڵ بێبەشە لەسۆزی باوك‌و هەموو بونەوەر سەرسامن لەناسۆریەکانی.

## یارمەتی خوایی بۆ بانگ خوازی خوایی

پاش ئەوەی کەوەڵامێکی بەوجۆرە بەرامبەر ئیبراهیم ووتراو هەموو خەڵکی بڕیاری ئەوەیان دا کەهەستن بەسووتاندنی ئیبراهیم (عليه السلام) لەپاداشتی ئەوەی کەخواکانیانی شکاندووەو ئەو ...عاریەی بەرامبەرکردوون.

ڕۆژێکی گەورەیە لەژیانی ئیبراهیمدا، گرانە بۆ ئەم بانگخوازە بەڕێزەو بێ کەسە، هەموو خەڵکی بەسەریدادێن تەنها کەسێك نەماوە پشتگیری بێت، دەرگاکانی دوونیا هەمووی داخرا بەسەریدا تەنها تیشکێك نەماوە لەڕووناکی‌و یارمەتی لەدەست ئەو ستەم کارانە ڕزگاری بکات.

---

(١) تفسیری قورئانی پیرۆز/عثمان عبدالعزيز محمد/١٠ (ص: ٣٧٣).

(٢) ووتەی بەڕێز/ مامۆستا صلاح الدين محمد بهاءالدين.

(ابن کثیر) لەم بارەیەوە دەفەرمووێت: (فجمعوا له حطبا کثیرا جداً) [1]

واتە: دارێکی زۆریان بۆ کۆکردەوە کەلە ئەندازەدانەبوو.

(السدی) (ڕەحمەتی خوایی لێ بێت) لەم بارەیەوە دەفەرمووێت: (حتى كانت المرأة تمرض فتنذر ان عوفيت ان تحملحطبا لحريق ابراهيم، ثم جعلوه في جورة من الارض واضرموها نارا، فكان لها شرر عظيم ولهب مرتفع لم توقد ناراً قطن مثلها وجعلوا ابراهيم عليه السلام في كفة المنجنيق). [2]

واتە: ئەوەندە بەپەرۆش بوون بۆ سوتاندنی تاپادەیەك، ئافرەتی وەها هەبوو نەخۆش دەکەوت دەیووت: بەڵێن بێ ئەگەر چاك ببمەوە کارم هێنانی دارێت بۆ سوتاندی ئیبراهیم، ئەوەندە بەپەرۆش بوون بۆ لەناوبردنی - پاشان لەچاڵەزەویەکدا کۆیان کردەوەو گڕیان تێبەردا، ئەو ئاگرەی کردیانەوە ئەوەندە گەورەبوو پریشکی گەورە گەورەی لێدەکەوتەوەو پشکۆکانی دارە پڕ لەئاگرەکانی زۆر بەرزبوو، کەلەهیچ سەردەمو شوێنێکدا ئاگری لەوجۆرە نەکرابووەوە، پاشان ئیبراهیمیان خستە ناو لایەکی - مەنجەنیقەکەوە، [3] بۆ ئەوەی هەڵیدەنە ناوی، کاتەکە زۆر ناهەموارە، خەڵکی هەمووی هەرەشە دەکەن، هاواردەکەن بەرەو ڕووی تاکە مرۆڤێك بیسووتێنن.. بیسووتێنن، ترپەی دڵەکانی لاوی بانگ خوازیەك لەسەریەك زیاد دەکەن. هەناسەکان خێراتر دەبن، ڕۆژێکی مێژوویيە لەژیانی ئیبراهیم دا چواردەور هەمووی دوژمنن دەستی خراپە درێژەو دەستە خێراوییەکان دیارنیە، هەموو سۆزو بەزەییەکان وەستابوون وەك گۆمەوەستەکان، تەنها جەستەیەك چەندەها ئەوەندەی خۆی پشکۆی سووری بۆ ئامادە دەکرێت، خۆپەرستەکان دوورەپەرێز وەستاونو جەستەی خۆیان لەبەردەم شنەی فێنکی باداراگرتووەو لاوی خوێن گەرمی بانگ خوازیش - ئیبراهیم - ئامادەدەکرێت بۆ دوا ساتەکانی ژیانی، درکەکان هەموو ئالاون لەتاکە خونچەی تازە پێگەیشتوو دەستە تاوانبارەکان توندبووبوون لەگەرد نەبێ تاوەنەکەی لاوی بانگ خواز.

لەم وەختە ناهەموارەدا ئەو (ئیمان)ە دێتە قسەو گەورەیو بەرزی خاوەنەکەی دەردەبڕێ بەرامبەر بەم هەموو ناسۆریەو بەرامبەر بەهەموو ئەوانەی کەوا تێدەگەن دەست

---

(١) تفسير القران العظيم/ج٣/ (ص: ١٧٥)/الطبعة المقنحه/دار اليوسف.

(٢) هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

(٣) مەنجەنیق: بریتییە لەو ئامێرەی لەشێوەی (کەوچك)ێکی گەورەدایە کەشتی تێدەکرێتو پێی هەڵدەدرێت بۆ شوێنێکی دوور. ئاگرەکەش ئەوەندە گڕی زۆربوو نەیان دەتوانی لەنزیکی بوەستن لەبەرئەوە بەم ئامێرە فڕێیاندایە ناوی.

درێژن بەسەر بێدەستەکاندا، بەرامبەر بەوانەی کەهەر دەسەڵاتە بەر جەستەکانی خۆیان لەبەرچاوەو خۆیان بەدەسەڵات داری سەرزەوی دەزانن و خەریکن لەئەشکەنجەدانی بانگخوازە خواییەکاندا، دەڵێ: ﴿حسبي الله ونعم الوكيل﴾ [1]

واتە: خوای گەورەم بەسەو تەنها ئەو پشتیوانەوە باشترین زاتێکە کەپاڵپشتم بێت و بێت بەیارمەتیەوە.

بەڵێ.. ئاگر پریشکی گەورە دەهاوێژێت و گەورەی و تینی لەئەندازەدا نیەو لەم لاشەوە مەنجەنیق (ئیبراهیم) (عليه السلام)ی تێکراوە، (مشهد)ێکی زۆر سەرسامکەرە بەڵام لەمانە هەمووی گەورەتر ئەوەیە چرکە بەچرکەو ڕووداو بەڕووداو بەدیهێنەری بوونەوەر بینەری ئەم بەسەرهاتانەیەو، تەنها بۆچاوتروکانێکیش بێئاگانیە لەئێرراوە خۆشەویستەکەی ـ ئیبراهیم ـ، هەتا وای لێدێ کار دەکاتە کۆتایی و خوای جیهان بەفەرمانێکی بێ گەڕانەوە دەکاتە یارمەتی بانگخوازی خوایی و ئاگرستانی بۆ دەکاتە فێنکی، هەروەك قورئان لەم بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿قلنا يانار كوني برداً وسلاما على ابراهيم﴾ (الانبياء: ٦٩)

واتە: فرمانمانکرد بە ئاگر وتمان: ئەی ئاگر ساردو سەلامەت بە لەسەر ئیبراهیم و ئازەحەتی مەکە.

ئیمامی (عەلی کوڕی ابی طالب) (رضي الله عنه) لەڕاڤەی ئەم دەقەدا دەفەرموێت: (ای لاتضریه).

واتە: مانای کەزیانی پێنەگەیەنی ئەی ئاگر.

(ابن عباس) (رضي الله عنه) لەبارەی ئەم دەقەوە دەفەرموێت: (لولا ان الله قال: وسلاما على ابراهيم لأذى إبراهيم بردها) [2]

واتە: ئەگەر بێت و خوای گەورە بەئاگرەکەی فەرمان نەکردایە کە سەلامەتی ئیبراهیم بپارێزێت، ئەوا ئەوەندە سارد ئەبووەوە کەساردیەکە ئازاری ئیبراهیمی دەدا.

ئەمەیە ئەو (رحمة)ی کەهات کەس ناتوانی بیگرێت، ئەمەیە ئەو یارمەتیەی کە لەسەرو هەموو هێزەکانەوەیە: ئەمەیە ئەو پاڵپشتەی کەئە هەموو کاتە ناهەموارەکانا هەر پاڵپشت و ناڕوخێ، هەموو هێزەکانی سەر زەوی (ئیمپراطور)ی ئەوکاتەی سەرزەوی بەهەموو تواناکانیەوە دێت بەجۆکدا لەبەردەمیدا تەنها بەفەرمانێك هەموو شتەکان

(١) ئەم ڕوایەتە لە(ابن عباس)ەوەیە/ابن كثير/ج٣/(ص: ١٧٥)/طبع منقحه.

(٢) قصص الانبياء/ابن كثير/(ص:١٢٨)/الطبعة المخرجة والمحققة.

دەگورێت، ئاگر دەبێـە فێنکی، ناخۆشی دەبێتە خۆشی، هـەموو بۆچونـەکان ئـاوەژوو، ئـەو خەڵکەی کەوەسـتان ئێسکی ئیـبراهیم دەریهێننـەوەو بەهـەموو ژێریەکیانـەوە ئـاگر خـەڵکی دەسووتێنێ بـەڵام لەگـەڵ فـەرمانی خـوایدا خزمـەتی خـەڵکی دەکـات بـەڵکو دەبێتـە یارمەتیدەری هەروەك چۆن ئاگرەکە تەنها ئەو پەتانەی سووتاند کەدەستی ئیبراهیمیان پێبەستبوو.

ئەمە (حقیقە)تێکەو نەگۆرە شتەکان هەموو بەندەی خوانو گوێڕایەڵین هـەروەك خـۆی دەفەرمووێ: ﴿ان کل من فی السماوات والارض الا اتی الرحمن عبدا﴾ هـەموو ئەوانـەی کەهـەن بـەندەی خـوانو گوێڕایـەڵی دەبـن ئینجـا کـاتێك کـەمرۆڤیش بەڕاسـتی ئـەم بەندەیەتیـەی خـوای هـەڵبژارد ئـەوا بـیروبۆچونو هەستو نەستی لەگـەڵ شـتەکانیتردا دەبنەیەك بیرو یەك پەرستن ﴿وان من شيء الا يسبح بحمـده﴾ هـەموو شـتێك تەسبیحاتی پەروەردگار دەکاتو مرۆڤیش دەبێتـە سـەر کۆرسـی هـەموویان هـەروەها شـاخەکان لەگـەڵ (داود) علیه السلام دەیانکرد﴿یاجبال اوبی﴾.

واتە: ئەی شاخەکان پاکوبێگەردی خواو تەسبیحاتی خـوا بکەنلەگـەڵ داود بەیەکـەوەو بۆی بستێنەرەوە.

ئەم ئاگرەش لەگەڵ ئیبراهم یەك پەرستن بوون هەردووکیان بەندەی خوان خزمەتکـەری یەکترن خەمخۆری یەکترن چونکە هەردووکیان گوێڕایەڵی دروسـت کـەریان کـردووە، کـاتێك کەخوای گەورە فەرمانی پێدەکـات سـاردبێتەوە پڕیەخۆشـی خـۆی دەردەبـڕێو بـەڵکو زۆر بەزووی چاوەڕێی ئەم فەرمانەیە لەبەر ئـەوەی هاوەڵـە خواپەرستەکەی بپـارێزێ لەدەست دوژمنان - ئیبراهیم - بپارێزێ ئیمامی(علی کـوڕی ابـی طـالب) (رضي الله عنه) دەفـەرموێت: (اذا مـات المسلم العابد بکی له موضعان ، موضع فی الارض وموضـع فـی السماء، فأمـا موضعـه مـن الاض فهی موضع عبادته،واما موضعه فی السماء فی مصعد عمله الصالح) (١)

واتـە: کـاتێك مرۆڤـی ئیمـاندار دەمـرێ دوو شـوێن بـۆی دەگریـن، شـوێنێك لـەزەوی‌و شوێنێك لەسەر ئاسمان، شوێنەکەی سەر زەوی شوێنی ئەو کاتانەی بوو کەپەرستنی لەسـەر دەکردو شوێنەکەی لەئاسمان شوێنی چوونە سەرەوەی کردەوە چاکەکانی بوو.

ئەم ئەرزو ئاسمانانە بۆیـە دەگریـن چونکـە ئـەو هاوەڵـەیان ون کـردووە کەلەگـەڵیاندا پەرستنەکەی ئەنجام دەداو یادی خوای دەخستەوە.

---

(١) محاضرة للدکتور/عصام البشیر/الطالب الجامعی وفقدان الهویه.

بەڵام ئەگەر مرۆڤی خوانەناس بوو ئەوا ئەخوای گەورە ئەو یارمەتی‌یەی دەداتو ئەئەرزو ئاسمانیش بۆی دەگرین، چەندەهای وەك فیرعەون کەخوای گەورە دەفەرموێت ﴿فما بكت عليهم السماء وماكانوا منظرين﴾ (الدخان: ٢٩)

واتە: کاتێك کەلەناوبان بردن ئاسمان بۆیان نەگریا، چونکە خواپەرست نەبوو لەگەڵ ئاسماندا بەیەکەوە بڕیاریان ندابوو کەفەرمانەکانی خوا بەجێبهێنن، ئەم پێکەوە ژیانەبوو کەئاگرەکەی پەرۆش کرد ئیبراهیم بپارێزێ.

جادوای ئەوەی کەئیبراهیم سەلامەت بوو لەئاگرەکەداو یارمەتی خوایی بۆهات خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وارادو به كيدا فجعلناهم الاخسرين﴾ (الانبياء: ٧٠)

واتە: ئەوان ویستیان کەئازاری بدەنو ئارەحەتی بکەن، بەڵام ئێمە خۆیانمان دۆڕاوکردو ژێرمان خستنو ئیبراهیم ڕاستگۆیی دەرکەوتو سەرکەوتوو بوو.

بەڵێ... ئازیزان ئەمەیە ئەو یارمەتی‌یەی کەخوای گەورە لەهەموو کاتێکدا بۆ بانگخوازانی ڕێگەی خۆیدا دەنێو دێت بەهاواریانەوەو دەیان پارێزێ لەدەست ستەم کاران، بەڵام کاتێك ئەم یارمەتی‌یە هەیە کەدڵەکان ڕاستگۆبن لەگەڵ پەروەردگاریانداو بکەنە پلەیەکی بەندایەتی ببنە هاوەڵی هەموو شتەکانی ترو بەیەکەوە هەموو بەندایەتی ڕاستەقینە بۆ پەروەردگار دەربڕن.

## پەندو ئامۆژگاریەکانی بەندی سێهەم

(١) تێگەیشتن لەو ڕاستیەی کەزۆرێك لەخەڵکی لەبانگی خوایی حاڵی نابنو نەزانن بەرامبەری، ئەم زانیاری‌یە زۆر پێویستە بۆ بانگ خوازان بەگشتی لەهەر کاتێکدان، نابێت ئەم دیاردەی ئەهاتنە سەر ڕێی خەڵکی ببێتە هۆی بێتاقەت بوونو ساردبوونەوەی، وابزانێ کەرەنجەکەی بێبەرە ئەوەتا ئیبراهیم (عليه السلام) باوکیو کۆمەڵەکەشی بەوشێوە ناخۆشەوە وەڵامیان دایەوەو بەڵکو ئازاریشیان دا بەڵام ئەبووە هۆی ساردبوونەوەیو وازهێنان لەگەیاندن ئەو پەیامە خوایی‌یە.

ئەمە سونەتی ئەم پەیڕەوخوایی‌یەو هەریەم شێوەش دەبێ هەردەم دوژمن دار دەبێو هەردەم کۆمەڵێ لە نەزانان هەن کەباوەڕی پێناهێنن، وە کۆمەڵێکیش هەن کەمردوونو نانی زیندوو دەخۆن کەئەمانە بەهیچ شێوەیەك دڵیان بەرامبەر ئەم پەیڕەوە ناجوڵێ هەروەك خوای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرمووێ: ﴿انما يستجيب الذين يسمعون والموتى يبعثهم الله﴾ (الانعام: ٣٦)

واتە: تەنها ئەوانە وەڵامی ئەم پەیامی خوایی دەدەنەوەو گوێی بۆ دەگرن‌و دەیکەنە پەیڕەوی ژیانیان کەدەبیستن‌و دڵیان نەمردووەو بەزیندوو دەژمێررێن، ئیتر مردووەکان کەدڵیان مردووەو باوەشیان کردووە بەدونیادا خوای گەورە زیندوویان دەکاتەوەو دەچینەوە بەریارەگای ئەوڵیان دەپرسێتەوە.

ئەی ئەوانەی کەبانگخوازان لەمزگەوتەکان‌و لەکەناڵەکانی (ڕادیۆو تەلەفزیۆن)ەوە بانگتان دەکەن، ئەی ئەوانەی بەڕۆژنامەکان ئەم پەیڕەوی ژیانیان بۆ ڕوون دەکرێتەوە پێتان دەگەیەنرێ، هەتا ڕۆژێك زووترە.

وەڵامی بانگی خوایی بابدەینەوە خۆمانهەڵوەسین بەوکاروانەوە کەزاتی(الله) خەمخۆزیەتی،باچیتر لەو مرۆڤانەنەبین کەخواناناسن ،با چیتر لە چارە ڕەشەکانی دوور لەبەزەیی خوایی نەبین، بالەئێستەوەخۆمان ئاژەلانە بەخێونەکەین بۆسوتە مەنی ئاگری دۆزەخ بانزیك بینەوەلەم ڕابوونەی کە ڕۆحی متمانە بە خۆبوونی جارێکی تر بەخشیەوە بەگەنجەکان،ئاشتی ئاشتەوانی خستەوە نادڵۆدەرونمان ئیسلامێك بەرنامەی هەموو ژیانی پێی‌یە خوای گەورە لەڕوژی دوایی‌دا (ئیبراهیم)علیە السلام بە (حجە) لەسەر قەومەکەی دادەنێ‌والله باباش بزانین ئەم هەموو بانگخوازەی ئێستاش هەیە لەسەر ئێمە بە (حجە)ڕای دەگرێ لەکام ڕۆژێشدا ،لەڕۆژێکدا کە هاوار دەکرێت ودەوترێت ﴿یاویلتنا ما لِ هذا الکتاب لایغادر صغیرة ولا کبیرة الا احصاها﴾ (الکهف: ٤٩)

واتە:ئای داماوی و هیلاکەت بۆ ئێمە ئەم پەرتووکە چی‌یە[1] کەهیچ کارێکی بچوك وگەورەی بەجێ‌نەهێشتووە وهەمووی بۆ ژماردووین و ئێستا بێ ئابڕوماندەکات لە بەردەم هەموو بوونەوەردا .

وەمژدەبۆئەوانەی گوێ بیستی ئەم ووتانە دەبن وڕووی ڕاستی درووستی وەردەگێڕن بەلای پەیڕەوی خواییاندا لەم بەڵێنەی پەروەردگار گەورەترو ڕاسگۆتر نابینین کەدەفەرموێت: ﴿الا من تاب وآمن وعمل عملاً صالحا فاولئك یبدل الله سیئاتهم الحسنات...﴾

واتە:پاش ئەوەی کەئەم ڕێگە ڕاستەیان هەڵبژارد ئەوا مژدە بێت لێیان کەهەرچی کردەوەیەکی خراپیان لەوەو پێش کردووە ئەوا بۆیان دەگۆڕێت بەچاکە.

---

(١) مانای پەرتووك نامەی کردەوەکانە.

(۲) هەوڵ دان بۆ لابردنی هۆکارەکانی بێ‌فەرمانی خوایی گەورەو نەهێشتنی زۆربوونیان ئەویش کارێکی سەرەکی ئیمانداراەو ئەمڕۆی موسڵمانان زۆر پێویستە لەهەموو هەڵسوکەوتو جوڵەیەکیاندا ئەم ئەرکەی سەرشانیان لەبیربێ هەروەك ئیبراهیم چۆن تەنها فرسەتی چوونەدەرەوە بۆ سەیرانی هێناو بتەکانی شکاند.

بەڵام ئەم گۆڕینی هۆکارانە لەم سەردەمەی ئێستای موسڵماناندا پێویستە بەلێکدانەوەو بۆچوونو زۆر ووریایی‌یەوە بێ‌و دوور لەنەزانیو هەڵەشەیی، بەڵکو بەپڕ لەحیکمەتو دانای دەبێ بکرێ، چونکە ئەمڕۆ داوەکان زۆرن بۆ موسڵمانانو دوژمنان یەكو دوان نین ئەمەش وویستی خوایە چونکە کاتێ باسی ئیمانو کفر دەکات دەفەرمووێ:

﴿وجعل الظلمات والنور﴾ (الانعام: ١)

واتە: تاریکیەکانو ڕووناکی دروست کردووە، بۆیە تاریکیەکان بەکۆمەڵ باس دەکات بەڵام ئیمانو ڕووناکی بەیەكو بەتاك ناوی دەبات.

ئێمەی ئەمڕۆی موسڵمانان پێویستە ڕاستەیەك هەیە کە بیزانین زۆرباشو بیکەینە سەر مەشقی کاروانەکەمان، ئەویش ئەوەیە کەپێویستە چاك بزانین ئەم پەیڕەوەی ئێمە پەیڕەوێکە هەموو (عەقل)ێکی تەواو پێ‌ڕازی‌یەو حەز بەپەیڕەوکردنی دەکات، وەئەوانەش کەبانگیان دەکەین بۆ لای ئەم بەرنامەیە خاوەن عەقڵن،و ژیرن کەواتە پێویستە پێش ئەوەی بچین دەستو قاچیان ببەستینەوەو بڵێین نابێ شتانێك بکەن کەدەبێتە هۆی دوور لەخوایی، پێویستە هەوڵ بدەین بەهۆی نزیك کردنەوەی ژیری ئەو مرۆڤە لەم پەیڕەوە وای لێبکەین (ئوتوماتیك)ی ببێتە مرۆڤێکی نەهی‌کەر لەخراپە.

وەڕاستیەکی‌تر ئەوەیە هەروەك (سید قطب) دەفەرمووێ ئێمە (رصید الفطرة).[1]

واتە: چەکی فیطرەتمان هەیە، هەموو فیطرەتێكو هەموو مرۆڤێك حەز بەوە دەکات کەچاکەی لەگەڵدا بکرێ‌و چاکە لەگەڵ خەڵکدا بکات، هەموو مرۆڤێك حەز دەکات لەناو چواردەورێکی باشخوازدا بژی، وەئەم ئیسلامەی ئێمەش هەر داوای ئەوانە دەکات.

کەواتە ئەوانەی کەلەخزمەت کردنو گەشەدان بەو شتانەی کەزیان بەخشن بۆ مرۆڤەکانو دەبنەهۆی دوور لەخوایی ژیریان لەدەست داوەو لەمرۆڤایەتی دەرچوون، وەتاکە شتێکیش کەمرۆڤەکان جیاکردۆتەوە لە ئاژەڵ بریتی‌یە لەژیری (عەقل).

---

(١) هذا الدين/سيد قطب

مانای تاکە کاری سەرەکی بانگ خوازان گەڕاندنەوەی ئەم بیرو هۆشانەیە بۆ جێگای خۆی بۆ ئەوەی خاوەنەکانیان خۆیان کەدڵو عەقڵیان پاك بۆوە ئەوا ئەوکات خودی خۆیان نەهی ئەکەن لەو خراپانە.

(٣) دۆزینەوەی ئەو هۆکارانەی کەخەڵکی لەگێژاوی نەزانیو وون بوون لەناو تاریکیدا دەردەهێنن، ئەو هۆکارو فرسەتانەی کەدەبێـە هۆی گەڕانەوەی عەقڵو بیرو هۆش بۆیان هەروەك چۆن ئیبراهیم بەحیکمەت بتە گەورەکەی نەشکاندو هێشتیەوە بۆئەوەی خەڵکی بێدەسەلاتی هەرە گەورەکەیانی بۆ دەربکەوێت.

ئێمەی بانگخوازانی ئەمڕۆی ئیسلامیش پێویستە ئەم جۆرە شێوازە پڕ لەحیکمەتەی ئیبراهیممان هەبێتو بگەڕێن بەووردی بەدوای ئەو هۆیانەی کەخەڵکی ووریا دەکەنەوەو ڕاستیان وەك خۆی پێپیشان دەدەن، ئەویش بەڕاستی بەحیکمەتێکی زۆرەوە دەبێتو پێویستە موسڵمانان ڕەچاوی بکەن.

وەئەوانەش کەبانگی خوایی دەدرێت بەپەردەکانی گوێچکەو دڵیانداو هەستو بیرو هۆشیان دێتەوە بەرخۆیان پێویستە نەگەڕێنەوە سەر بێهۆشیەکەیان وەك گەلەکەی ئیبراهیم کردیانو گەڕانەوە بۆ نەزانیەکەی جارانیان بەڵکو دەبێت ڕاستیەکان کێشانەی شتەکان بنو هەرکات وویژدان بۆ ڕاستیەك جوڵا ئەوا پەرە بەو جوڵاندنە بدرێت لەتەسکی تاریکی ڕزگاری ببێت بۆ بەرینی ڕووناکی، سەرۆکایەتی بەنرخ ترین جەستە کە جەستەی مرۆڤە جوانترین بەدیهێنراوی خوایە دەبێت باشترین سەرۆك بیکات کەژیریە (عەقل)، وەهەرکات ئەم عەقڵە سەرۆك بوو ئەوا پەیوەستی پەیڕەوی خوای دروست دەبێت چونکە ژیریو نیگای خوایی وەك هەنگو گوڵ وان هەنگ هەرچەندە زۆربن بونەوەرێکی سەرسام بن ئەوا بێشیرین گوڵەکان بێبەرهەمن.

ژیری مرۆڤیش بێ لەنیگای خوای وەك جەستەیەکی بێڕۆحوایە هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وكذالك اوحينا اليك روحا من امرنا﴾ (الشورى: ٥٢).

واتە: ئابەم شێوەیە ئێمە ناردمان بۆت بەنیگا ڕۆحێك لەلایەن خۆمانەوە.

ئەم دەقە ئەوە دردەخات کە عەقڵی مرۆڤ جەستەیەو نیگای خوایی (قورئانو سونە)ش بریتین لەو ڕۆحەی کەتوانای جوڵاندنو بزواندنی پێدەبەخشێ.

(٤) پێویستە لەسەر بانگ خوازان پێش هەموو کارێك خەریکی بنیادنانی قەڵای ئەو ئیمانەیانبن کەهێنرە دەرەکیەکان ناتوانن بیروخێنن لەناخیاندا

چونکە ئەم ڕێگەی بانگ خوازیە بریتیە لە ڕێڕەوەێك کەبەرەو باخە نەبڕاوەکانی بەهەشت دەڕواتو پڕە لەدژایەتیو ناهەمواری بەرامبەری بانگخوازان هەروەك چۆن بەرامبەر ئیبراهیم

کرا (علیـه السـلام)، ئەمـەش ڕاسـتی ئـەو گوفتـارەی شـیرینەی پێغەمبـەر (ﷺ) دەردەخـات کەدەفەرمووێت: ((حفت النار بالشهوات وحفت الجنة بالمكاره)).

واتـە: ئـاگری دۆزەخ ڕازێنراوەتـەوەو چـواردەورێگـیراوە بـەئارەزووەکان‌و بەهەشـتیش چواردەور دراوە بەناخۆشی‌و نارەحەتی.

لەبەرئـەوە برایـانی بـانگخوازی خـوای پێویستە چاك لـەیادیان بێـت کـەزۆرجار ئـەم ڕوویەڕووبوونەوەیـەو دژایـەتی کردنـە ڕووی تێدەکات لـەڕێڕەوی کـاروانیدا کەئـەویش بـۆ دەرخستن‌و پاداشت دانەوەی ڕاستگۆیانە لای خوای گەورە، یاخود ڕاستتروایە بڵێین کەئەمـە سونەتی ئیمانـەو تاقیکردنەوەیـەتی لەلایـەن پـەروەردگارەوە، هـەڵگرانی ئیمـان دەبـێ ئەوەندەبن کەشایەنی ئەو ڕێزەبن.

شەهیدی ئیسلام (سید قطب) بەرزترین ووشـە لـەزاری دەدرکێنـێ‌و دەڵـێ: (ان الایمـان امانة الله فی الارض، لایحملها الا من هم لها اهل وفیهم علی حملها قدرة) (١)

واتە: ئیمان سپاردەو ئامانەتی خوایە لەسـەر زەوی، شـایەنی هـەڵگرتنی نیـەو نـاتوانێ هەڵیبگرێ تەنها کەسانێك نەبن کەئەهلی ئەوەن‌و توانای هەڵگرتنی ئەو ئامانەتە گەورەیان تێدایە.

بەڵێ... خاوەنەکانی ئیمان هەردەم لەتاقیکردنەوەی گـەورەدان بۆیـە دەبێـت ئـەهلی هـەڵگرتن بـن‌و شـایەنی بـن، ئـەم شـایەن بوونـەش بـەئارامگرتن دەبێـت لەبـەردەم تاقیکردنەوەکانداو جێگیری‌و نەڕووخان لەبەردەم پیاکێشانەکاندا.

خۆ کاتێك بانگ خوازی خوایی توشی ئەم تاقیکردنەوانە دەبێت، ئەوە نەبێت کەخوای گەورە، ئازارو زیانی بانگخوازانی ڕێگەکەی خۆی بوو یێت بەڵکو بەپێچەوانـەوە هـەرگیز وانیـە بـەڵکو بەشێوەیەکی‌ترە کەوەڵامەکـەی لـەمرۆڤێکی بینـا بـەم تاقیکردنەوانـە وەردەگـرن کەمامۆسـتای بـەرز (سـید قطـب) چونکـە خـودی خـۆی سـاڵەکانی ژیـانی لەئەشـکەنجەی بەندیخانەکانی میسردا بردەسـەرو بەڕاسـتی ئـەو تاقیکردنەوەیـەی بینـی‌و خۆڕاگریـش بـوو لەسەری تا سەر پەتی ئەو قەنارەیەی سەری بەرزکردەوە لای پەروەردگاری‌و لەپێناوی ئـەم ڕێگە پیرۆزەدا شەهیدکرا.

(سید) دەفەرموویێ: (وما بـالله ـ حاشـا لله ـ ان یعـذب المؤمنـین بـالابتلاء، وان یؤذیهم بالفتنـه، ولاکنـه الاعـداد الحقیقـی لتحمـل الامانـة، فـهی فـی حاجـه الی اعداد خـاص لایتـم الا بالمعاناة العملیه للمشاق) (٢)

---

(١) فی ضلال القرآن/سید قطب/ج٦/(ص:٣٨٢)/طبعه بیروت ـ لبنان.

(١) فی ضلال القرآن/سید قطب/ج٦/(ص: ٣٨٨)/طبعه بیروت.

واتــە: پــاك و بێگــەردی بــۆ خــوای پــەروەردگارو دووری بێ لــە خوای پــەروەردگار کەئیمانداران ئەزیەت بدات بەتاقیکردنەوە، هەرگیز خوای گەورە ئەزیــەتی ئیمــانداران نــادات، بەڵکو پێگەیاندن و ئامــادەکردنێکی ڕاستــی‌یە بــۆ توانــای هــەڵگرتنی ئــەو ئەمانەتــە گەورەیــە کەئیمانە، ئەوانــەی کەئــەو ئیمانــە هــەڵدەگرن پــێویستیان بەپێگــەیاندنێکی تایبــەتی هەیــە لەپێگەی خوایدا. ئەویش بەناخۆشی سەر ڕێگاو ئارامگرتن لەسەر ئەو ناخۆشیانە.

لەبەرئەوە پێویستە بانگخوازانی خوێن گەرمی خوایی ئــەوە بزانن کەئــەم ناخۆشیانەی کەبەسەریاندا دێت هەمووی بریتی‌یە لەپێگــەیاندنی ســەرباز لەســەربازگەی گــەورەی خوایـداو دروست کردنی هەڵگرانی ئەمانەتەکەیە.

(٥) گرنگــترین خــاڵێك لــەم چیرۆکــەو پــەندو ئامۆژگاریەکانیشیدا بریتی‌یــە لــەم خاڵــە، کەباس لەپشت بەستن دەکات لەسەر خوا (التوكل على الله)و بــاوەڕبوونی پتــەو بەپشــتیوانی خوای گــەورە بــۆ بــەندە ستەم لێکراوەکــان، ئەوانــەی کەبــەبێ تــاوان ئەشــکەنجە دەکرێــن و ستەمیان لێدەکرێ.

ئــەم جــۆرە بــاوەڕە بــەڕەنگێکی تــەواو لــەئیبراهیم دا هــەبوو، بەتایبــەتی لــەو کاتــەدا کەهەموو یارمەتیەکانی ســەر زەوی بــڕان و هیواکــان لــەگۆڕنران و بڵێســەو گــڕی ئــاگر پــەرەی ســەند، ئالــەم وەختــە نادەموارەدا ئیــبراهیم بەوپــەڕی هیمــەت بەرزیــەوە، بەوپــەڕی باوەڕبوونەوە ووتی: ﴿حسبي الله ونعـــم الوكيـــل﴾ و بەوپــەڕی پشت بەستن بــەخوای گــەورەوە خــۆی ئامادەی ئــەو سزا گەورەیە کــرد ئەمــەش بــەری دیاردەیەکــە دەیخــوات کەبریتی‌یە لە(الاتصال الوثيق) پەیوەندیەکی پتەو لەنێوان بەندە لەسەر زەوی خوای گەورە لەئاسمان، پەیوەندیەکــە هــەموو بەربەستەکان دەپچڕێنــێ و دەیــان بــڕێ، گەیەنــەرێك ئــەم پەیوەندیە دەگەیــەنێ شتە بەرجەستەکان نیــە بــەڵکو (الايمــان العميــق)ە ئیمــانێکی قــوڵ و پڕوپڕە بەپەروەردگار، ئەم پەیوەندیە لەهەموو ئیماندارێکدا پێویستە هەبێ بەتایبــەتی و زۆر بەتایبەتی لە(بانگخوازان)دا.

پێویستە هــەردەم ئــەم گەیەنــەرە کەئیمانــە، لاواز نــەبێت و خزمــەت بکــرێ لەلایــەن خاوەنەکانیانــەوە، تــاکو شــایەنی ئــەوەبێت کــەخوا یارمــەتی بــدات و ڕووی ئــەوەی هــەبێت کەبڵێت ﴿حسبي الله ونعم الوكيل﴾.

هەرکات بەم شێوەیە ئامێری پەیوەندی یەکــەمی لەکــەم و کــوڕی پاراست و هــەردەم لــە پــەیوەندی کردنــدا بــوو بــۆلای پــەروەردگاری لەکاتــە ئاســاییەکاندا، ئــەوا لەکاتــە زۆر

هەموارەکانیشدا زۆر بەهیمەت بەرزیو بەباوەڕێکی پتەوەوە دەڵێت: ((اللهم اليك اشكو ضعف قوتي وقلت حيلتي)) (١)

واتە: ئەی پەروەردگارە بۆلای تۆ بێدەسەڵاتی خۆم ئەنێرمو شکات دەکەمو هیچ کەسێك نەماوەو لەتوانای هیچ کەسێکدانیە یارمەتی دەرم بێت تەنها تۆنەبی.

ئەوکات ڕەحمەتی خوایی لەشێوەی یارمەتیدا دێت بەهاناوە، بەڵام کام یارمەتیەك، ئەو یارمەتی‌یەی کەهەموو مرۆڤایەتی ناتوانن بیوەستێنن، بەڵکو بێتوانان لەئاستیدا ئیتر باهەموو سەرزەوی هێزش بەرێ تازە ڕەحمەت هات بائاسنو ئاگرەکان زۆرین، هەرچەند بن بێهودەن لەبەردەم ئەم ڕەحمەتە خواییەدا.

بۆ زیاتر چە سپاندنی ئەم خاڵە پڕ لەسوودە، دەچینە خزمەت شەهیدی قورئانو گوێڕادەگرین بۆ (سید) بزانین لەناو چوارچێوەی دیوارە ڕەقەکانی زیندانەدا لەبەردەم زەبروزەنگی ستەم کارانداو لەگەڵ ئەو هەموو خەمخۆریە بۆ موسڵماناندا، چۆن ڕۆحیەتی ئەم ڕاستیەمان بۆ دەپاڵێوێ کەلەڕافەی دەقی: ﴿مايفتح الله للناس من رحمة فلا ممسك لها ومايمسك فلا مرسل له من بعده وهو العزيز الحكيم﴾ (فاطر: ٢)

واتە: هیچ ڕەحمەتێك نیە کەخوای گەورە بۆ بەندەکانی کردبێتەوە کەسێك ناتوانێ بیگرێو هەر شتێکیشی‌گرت ئەوا کەس نیە بتوانێ بینێرێ، بەڕاستی خوای گەورە بەتوانایە کەڕەحمەت بنێرێو ئەشزانێو بەحیکمەتە بۆ کێی دەنێرێو نایینێرێ.

دەفەرمووێت: (انها تقطعه عن شبهة كل قوة في السماوات والأرض وتصله بقوة الله، وتيسئة من مضنة كل رحمة في السماوات والارض وتصله برحمة الله. وتوصد امامه كل باب في السماوات والارض وتفتح امامه باب الله وتغلق في وجهه كل طريق في السماوات والارض وتشرع له طريق الى الله) (٢)

واتە: ئەم (دەقە)و مانا پڕ لەجوانیەکەی مرۆڤ دائەبڕێ لەئەگەری هەموو هێزێك لەسەر زەویو لەئاسمانو دەیبەستێتەوە بەهێزی خواوە، وەبێ هیوای دەکات لەهەموو بەزەیی سۆزێکی لەئاسمانەکانو لەسەر زەویو دەیبەستێتەوە بەسۆزو میهرەبانی خواوە، هەموو دەرگاکانی زەویو ئاسمانەکانی بەڕوودا دادەخاو دەرگای خوای بەخشندەی لێدەکاتەوە وەهەموو ڕێگە گرتنەبەرێکی لەئاسمانەکانو زەویدا لەبەردەمدا دادەخاتو تەنها ڕێگەی خوای پێش دەم دەخات.

---

(١) ئەم نزایە پێغەمبەر (محمد) (ﷺ) دوای ئەو ناڕەحەتیانە کردی کەلە (طائف) بەسەریدا هات.

(٢) في ظلال القرآن/سيد قطب/ج٦/(ص: ٦٨٨)/طبعه بيروت.

بەڵێ... (سید) چاك لەماناى ئەم دەقە گەیشتبوو بۆیە هەتا دوا ساتەکانی ژیانی لەخزمەت پەیڕەوی خوایدا بەخت کردوو، نەترسا لەئاگرو ئاسنی زۆرداران چونکە ڕەحمی خوای لێوە نزیك بوو، شەوێك پێش ئەوەی کەببرێت بۆ سەر تەختەی مەرگی، خەوێك دەبینێ کەپێغەمبەر (ﷺ) هاتۆتە خزمەتی‌و مژدەی پێداوە کەدێتەلای. باوەڕیوون بەم ڕەحمەتەیە بانگخواز بارگاوی دەکات‌و بەرگەی ناخۆشیەکانی پێ دەگرێ.

پاشان ئەگەر مرۆڤێ ئەمە بوو کەئەم ڕەحمەتی خواییەی بۆ بێت ئەوا لەهەموو کات‌و ساتێکدا گران نیە ڕەحمەت داوابکات‌و بەهانایەوەبێت، واتە لەوکاتانەدا کەهەموو یارمەتیەکان دەبڕێن‌و نامێنن هیچ گران نیە ڕەحمەتی خوایی جێی هەموویان پڕدەکاتەوە.

جارێکیتر دەچینەوە خزمەت (سید)و هەست‌و ئەستی بۆ ووشە پڕ لە گەوهەرەکانی ڕادەگرین کەدەفەرموێت: (ورحمة الله لاتعز على طالب فى اى مكان ولا فى اى حال. وجدها ابراهيم ـ عليه السلام ـ فى النار، ووجدها يوسف ـ علية السلام ـ فى الجب كما وجدها فى السجن. ووجدها يونس ـ عليه السلام ـ فى بطن الحوت فى ظلمات ثلاث. ووجدها موسى ـ عليه السلام ـ فى اليم وهو طفل مجد من كل قوه ومن كل حراسة. كما وجدها فى قصر فرعون وهو عدو له متربص به ويبحث عنه. ووجدها اصحاب الكف فى الكهف حين افتقدوها فى القصور والدور. فقال بعضهم لبعض ﴿فأوروا الى الكهف ينشر لكم ربكم من رحمته﴾ ووجدها رسول الله (ﷺ) وصاحبه فى الغار والقوم يتعقبونها ويقصون الاثار..)[1]

واتە: ڕەحمەتی خوا بەهیچ شێوەیەك گران نیە بۆ کەسێك داوای بکات لەهەرکات‌و لەهەر حاڵێکدا بێت. ئەوەتا ئیبراهیم لەئاگردا دەیدۆزێتەوە، یوسف ـ علیها السلام ـ لە ناو بیردا دەیدۆزێتەوە هەروەك چۆن لە بەندیخانەدا دەیدۆزێتەوە. یونس ـ علیە السلام ـ لەسکی نەهەنگەکەدا دۆزیەوە، جارێکی تریش ئەم ڕەحمەتە مووسا لەئاودا دۆزیەوە بەمنداڵی کەهیچ تواناو زانیاریەکی نەبوو تەنها لەناو سەبەتەکدا بوو، هەروەك چۆن لەکۆشکی (فیرعەون)دا دۆزیەوە کەدوژمنی بوو بەدوایدا دەگەڕا. هەروەها گەنجەکانی ناو ئەشکەوتەکە. لەئەشکەوتەکەدا دۆزیانەوە کاتێك ئەم ڕەحمەتەیان لەکۆشك‌و خۆشیەکانی ناوشاردا وون کرد، بەیەکتریان ووت (برۆن بۆ ئەشکەوتەکە خوای گەورە ڕەحمی خۆیتان بۆ دەنێرێ). وەپێغەمبەری ئیسلام محمد (ﷺ) لەوکاتەدا دۆزیەوە کەلە ئەشکەوتەکەدا بوون لەگەڵ ئەبوبەکر (رضي الله عنه) دوژمنانی دوایان کەوتبوون.

بەڵێ.. ئازیزان ئەم ڕەحمەتەی خواییە لەهەرکات‌و لەهەر شوێنێکدا بێت تەنها داوای بکەیت‌و شایەنی ئەو داواکردنەبێت ئەوا هەموو بەربەستەکان دەبڕێ‌و درکەکان دەکاتە

---

(١) فى ضلال القرآن/ج٦/(ص: ٦٧٠)/طبعه بيروت.

ئاوریشم، ئاگرو ئاسنی تواوە دەكاتە دانیشتگایەكی فێنك،ماڵی دوژمن دەكاتە شوێنی حەوانەوەو خۆشی. كەواتە ئێمەی موسوڵمان بە گشتی بانگخوازان بەتایبەتی، بیرمان بێتەوە كە ئەم ڕەحمەتە خواییە هەیەو بێ هیوا نەبین ئەگەربێتو لەناوجەرگەی ئاگریشدا بووە.

(٦) ڕاستیەكیتر لەم بەندەدا ئەوەیە كەئیمانداران و مرۆڤایەتیش چاك بزانن كە ژیان و مردن تەنها بەدەست پەروەردگارەو، هەموو هێزی سەرزەوی ناتوانێ مرۆڤێك لەژیاندا نەهێڵێ ئەگەر بێت و ویستی خوای لەسەر نەبێ وەهەموو مرۆڤایەتی ناتوانێ مرۆڤێك لەژیاندا بهێڵێ ئەگەر بێتو ویستی پەروەردگار لەسەر ئەوەبێت كەبەرەو ڕۆژئاوایی بكەوێتە ڕێ.

ئیبراهیم هەموو هێزەكان بۆی كۆبوونەوە، خەڵكی هەمووی چواردەوریان گرت ـ ئایا توانیان ڕۆحی دەربهێنن؟ ـ ئایا ئاگرەكە بلێسە دارنەبوو؟ ـ ئایا فرێ نەدرایە ناوەڕستی ئەو ئاگرەوە؟

ئەمانە هەمووی ڕوویدا بەڵام ویستی خوای گەورە لەسەرئەوە بوو كەبێزیان بێت.

پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) فەرمووەدەیەكی شیرین بەیەكێك لەهاوەڵان فەرموەوە كە(ابن عباس)ە دەفەرموێت: ـ ڕۆژێك لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) دەرۆیشتم لەدوایەوە (لەسەر ئاژەڵ) پێی وتم: ((ياغلام انى اعلمك كلمات: احفظ الله يحفظك، احفظ الله تجده تجاهك، اذا سألت فسأل الله، واذا استعنت فاستعن بالله واعلم ان الأمّة لوا اجتمعت على ان ينفعوك بشيئ لم ينفعوك الا بشيئ قدكتبه الله، وان جتمعوا على ان يضروك بشيئ لم يضروك الا بشيئ قد كتبه الله عليك، رفعت الاقلام وجفت الصحف))(١)

واتە: ئەی مێرد منداڵ چەند ووتەیەكت فێردەكەم، كەپڕە لەپەندو خێر، بۆتو بیان زانە.

سنوری خوا بپارێزەو پەیوەست بە فرمانەكانیەوە، ئەوا دەت پارێزێت لەهەموو خراپەیەك. سنوری خوا بپارێزە، هەردەم دەیدۆزیتەوە لەیارمەتی دانت دایە لەهەركوێبێت. ئەگەر داوای هەرچیەكت كرد، ئەوا داوا لەخوا بكە، وەئەگەر پێویستیت بەیارمەتی بوو لەهەر كاتو شوێنێكدا ئەوا داوا لەخوابكە وەچاك بزانە، ئەگەر هەموو بوونەوەر كۆببنەوە لەسەر ئەوەی كەخێرو چاكەیەكت پێبكەیەنن، هیچت پێناگەیەنن، تەنها ئەوە نەبێ كەخوای گەورە دیاری كردووە بۆت.

وەئەگەر كۆببنەوە لەسەر ئەوەی كەزیانت پێبكەیەنن، ناتوانن زیانت پێبكەیەنن بەهیچ شێوەیەك، تەنها بەوە نەبێ كەخوا ووستی لەسەرە، هەموو شتێك لەزانیاری خوای گەورەدا نوسراوەو، ئەوپەڕەی زانیاریانەی لەسەری نووسراون ووشك بوونەوە،و بەهیچ شێوەیەك ناگۆڕێ(٢)

---

(١) رواه الترمذي حديث صحيح.

(٢) الوافى فى شرح اربعين النوويه/مصطفى البغا ـ محسن الدين .

# بەندی چوارەم

## ڕووبەڕووبوونەوەی ئیبراهیم لەگەڵ پادشادا

ئازیزان.. جارێکیتر هاتینەوە خزمەتی باخچەی بەسەرهاتەکانی ژیانی ئیبراهیم (علیە السلام) پاش ئەوەی کەبەوشێوە دیارە باسمان لەبەندی سێهەمو بەسەرهاتەکانو پەندەکانمان کرد، ئێستا دەدوێین لەبەشێکیتر لەژیانی ئەم پێغەمبەرە شیرینەی خوای گەورەو برێکیتر لەژیریمانی پڕزیندوو دەکەینەوەو دەیکەینە پەندو ئامۆژگاری بۆ ژیانی ڕۆژانەمان.

دوای ئەوەی کەئیبراهیم (علیە السلام) بەساغیو بێ ئازار لەئاگرەکە هاتە دەرەوە بەهۆ یارمەتی خوایییەوە بۆی، [1] ئەمجارە دەستی کردە بانگ کردنی پادشای ئەو سەردەمە کەداوای خوایەتی دەکرد بۆ خۆی [2]

وەهەروەڵی ئەوەی دەدا کەبۆی بسەلمێنێ کەهەرگیز ناشێ کەئەم بەندەیەکەو داوای خوایەتی بۆ خۆی بکات، بەڵکو خوایەتی پێویستی بەدەسەڵاتو گەورەییو خاوەندارێتییەکی تەواوەو زۆر لەوە گەورەترە کەئەم بەندەیە ـ پادشا ـ تێیگەیشتووە.

(مفسرون)و زانایانی مێژوو دەڵێن: ئەم پادشایەی پادشای (بابل)بووەو ناوی (نمرود بن کنعان بن کوش بن سام بن نوح) بووە [3] و پاشای سەرزەوی بووە [4]

قورئان لەم بارەیەوە دەفەرمووێت: ﴿الم تر الى الذي حاج ابراهيم في ربه ان اتاه الله الملك اذ قال ابراهيم ربي الذى يحي ويميت قال انا احي واميت قال ابراهيم فان الله يأتي بالشمس من المشرق فأت بها من المغرب فبهت الذى كفر والله لايهدى القوم الضالمين﴾ (البقرة: ٢٥٨)

---

(١) مفسرون ناكۆكن لەسەر ئەوەی ئەم ڕووبەڕووبونەوەیە پێش سووتاندنەکەبوو یان پاش سووتاندنەکە، ئێمە بۆیە لەدوای سووتاندەکە باسمان لێوە کردووە چونکە لەزۆربەی پەرتووکەکانی چیرۆکی پێغەمبەراندا وانووسراوە وەك (ابن کثیر، عبدالوهاب نجار)

(٢) قصص الانبياء/ابن كثير/(ص: ١٢٩). الطبعة المخرجة.

(٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو، تفسير الكبير/الامام فخرالدين/ج٧ ـ ٨/(ص: ٢١).

(٤) قصص الانبياء/ابن كثير/چوار کەس هەبووە کەهەموو سەرزەوی فەرمان کردبێ ئەویش دوانیان (کافر) دوانیان (ئیماندار)، دوو کافرەکە (نمرود، بختنصر).وە دووئیماندارەکە (ذو القرنين وسليمان پێغەمبەر (عليه السلام)).

واتە: ئایا نەتبینی ئەوەی کەچاوی دڵی کوێربوو بوو، لەخۆی بابی بوو ئینکاری ئەکرد بەرامبەر بە ئیبراهیم کەباسی تاکەخوایی بۆ دەکرد.

کاتێك ئیبراهیم پێیووت: خوای من خوایە کە دەژێنێ دەمرێنێ بەتێکردنی ڕۆح بەناو جەستەداو دەرهێنانەوەی [1] ئالێرەدا (نمروود) ووتی: منیش دەژێنمو دەمرێنم.

ئیبراهیم: ووتی دەی خوای من ڕۆژ لەڕۆژهەڵاتەوە دەهێنێت بۆ ڕۆژئاوا دەی تۆ لەڕۆژئاواوە بیهێنە بۆ ڕۆژهەڵات ئەگەر ڕاست دەکەی تۆ خوایت، ئالێرەدا بێ دەسەڵاتی دەرکەوتو لەقسەکەوتو لەخۆبایی بوونی نەما وەبەڕاستی هەرکەس ئاوا ستەم کاربێت ئەوا خوای گەورە یارمەتی دەری نابێ.

ئیمام مخرالدین الرازی (خوای لێڕازیبێ) لەبارەی ئەم دەقەوە دەفەرمووێ: باس کردنی هێنانی ڕۆژ لەڕۆژئاواوە دابەزین نیە لەدەلیلی یەکەم کەزیندوکردنەوەو مردنە، بەڵکو بەنەمرود دەڵێت ئەو مردنو زیندووبوونەوەیەی کەلە دەسەڵاتی تۆدایەو مرۆڤ دەتوانێ بیکات، هەموو جوت بونێك منداڵ پێك دەهێنێو هەموو (ژەهرێك)یش مرۆڤ دەکوژێ [2]

بەڵکو ئەو زیندوکردنەوەو مردنە بەهۆی ئەو ڕۆژەوەیە کەلەڕۆژهەڵاتەوە هەڵیەتو دەیدا لەزەوی و ڕوەك پێك دێنێو مرۆڤ دەیخواتو پاشان دەبێتە ئەو تنکۆکە ئاوەی کەمرۆڤی لێپێك دێو مردنیش بەهۆی ئامرازە بەرجەستەکانی سەرزەوی نیە وەك (ژەهر)و کوشتن بەچەك بەڵکو کاتێك ڕۆح دەردەچێ کەس نازانێ کێ دەری دەکات، ئایا ئەم ڕۆژهێنانە بەم هەموو حیکمەتو چاکیەوە بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی کەدەستێکی بەڕێوەبەر دەبیات بەڕێوە.

دەی تۆ ئەی (نەمرود) ئەم هەموو حیکمەتەشی باتێدا نەبێ بەڵکو تۆ لەڕۆژئاواوە بیهێنە ئەگەر ڕاستیەکەی کەخوایت.

بەڵێ.. ئازیزان هەردەمو لەهەموو سەردەمێکدا ئەم لووت بەرزانە ئەمە بیروبۆچوونو بیرکردنەوەیان بووە، هەرکەمێك دەسەڵاتو دەوڵەمەندی ڕووی تێکردون لەخۆیان بایی بوونو سەرکەشو گومڕای پیشەی سەرەکیان بووە ئێستاش زۆرێك لەشێوەی نەمرودا هەیە کەبەتەنها تۆزێك دەسەڵات لەخۆبایی بوون ڕویان تێدەکاتو دەبنە خوای دەستکردی خەڵکی، ئیتر بێئاگان لەگەورەی خوای گەورەو فراوانی دەسەڵاتی، ئیتر بیریان دەچێتەوە

---

(١) تفسير المقتطف/د.مصطفى خرم دل/(ص: ٧٧)..

(٢) مفسرین دەڵێن کەئەم پاشایە دوو کەسی هێنارە یەکێکیانی کوشتووەو ئەوی تریانی بەرەڵاکردوە بەبۆچونی خۆی ئەمیش مردنو زیندووبونەوەی کردووە.

کەلەتنۆکێ ئاوی قێزەوەند دروست بوون کەچی ئێستا ئاوا لووت بەرزن نازانن کەبەندەی خاوەندارن و ناسنامەی بەندەیەتی یان بەناوچەوانەوەیە، بەکورسیەك کەلەسەری دانیشتووە ئیتر وادەزانێ گەورەی جیهان ئەوە، نازانێ کەئەگەر ئەو کورسی یە بۆ پێشیانی خۆی بمایە نەدەگەیشتە ئەو (لودام الكرسي لغيرك ماوصل اليك) (١)

نازانن لەبارانی خوا ئاو دەخۆن، لەزەوی خواوە خواردەمەنی دەردەهێنن، لەسەر خاکی خوا دەژین، هەوای خوا هەڵدەمژن، هەتاوی خوا گەرمیان دەکاتەوە، لەهەمووی سەرووتر خۆیان خوا دروستی کردوون.

لەگەڵ هەموو ئەم نیعمەتانەدا دژایەتی شوێن کەوتوانی دینی خوادەکەن و دەبنە خوای سەر زەوی وەك (نەمروود).

تاکە شتێکی زۆر گەورەکە جیایمان دەکاتەوە لەئاژەڵەکان لەهەڵس وکەوتدا بریتی یە لەژیری، بەڵام مەخابن ئەمانە ئەوەندە دوای هەواو نەفسی خۆیان کەوتوون ئەم دەستکەوتە مرۆڤانەیەشیان لەدەست داوە.

## کۆچ کردنی ئیبراهیم (علیه السلام) و بەجێهێشتنی دۆستانی دوور لەخوا

پاش ئەوەی کەبانگخوازی خوایی بەبەردەوامی خەریکی ناساندنی خوا بوو بەخەڵکی و هەوڵێکی زۆری لەگەڵدا دەدان و لەسەر ئەم هەموو هەوڵ دانەشەوە ئازاریشیان داو ئاگریان بۆ کردەوە کەبیسوتێنن بۆی دەرکەوت کەئەم کارەی ئەم بێسوودەو ئەگەرێت و زیاتر تیایاندا بمێنێتەوە ئەوا زیاتر زیانی پێ ئەگەیەنن. لەبەرئەوە بڕیاری ڕۆیشتنی دا ئەویش بەئیزنی خوای گەورەو ڕێنمایی پەروەردگار، چونکە پێغەمبەران خوای گەورە ڕێنیشاندەریانە، ئەوەبوو لەلاپەڕەکانی پێشوودا باسمان لەوەکرد، کەچۆن کاری بانگخوازی بەجێدەهێنا لەگەڵ باوك و کۆمەڵگەکەی داو باوکی و کۆمەڵگەکەی چۆن وەڵامیان دایەوە، لەدوای ئەمانە هەموویەوە هەستا بەجێهێشتنیان و ڕۆیشتن لەوخاکە.

هەروەك قورئان دەفەرموێ ئیبراهیم ووتی:﴿واعتزلكم وما تدعون من دون الله﴾ (مريم: ٤٨)

واتە: بەجێتان دەهێڵم و خۆم بەدوور دەگرم لەوشتانەی کەئێوە جگە لەخودا داوایان لێدەکەن.

ئەم قسەیە، ئیبراهیم لەوکاتەدا بووکەباوکی بانگ کرد بۆ یەکتاپەرستی بەڵام باوکی زۆر بەدڵ ڕەقیەوە وەڵامی دایەوە.

---

(١) خطبة جمعه لدكتور يوسف القرضاوي ـ القيامة ـ

پێغەمبەر (ﷺ) لەم بارەیەوە دەفەرمووێ:((يلقى ابراهيم أباه آزر يوم القيامة وعلى وجه آزر قترة وغبرة، فيقول له ابراهيم: الم اقل لك لاتعصني؟ فيقول ابوه: فاليوم لااعصيك. فيقول ابراهيم: يارب انك وعدتني ان لاتخزني يوم يبعثون، فأيي خزي أخرى من أبي الابعد؟ فيقول الله تعالى: اني حرمت الجنة على الكافرين. ثم يقال: يابراهيم ماتحت رجليك فينظر فاذا هو بذيخ ملتطخ، فيؤخذ بقوائمه فليقى فى النار)) (١)

واتە: لەڕۆژی دوایدا ئیبراهیم دەگات بەباوکی کەدەموچاوی ڕەشیو تەپوتۆزو پیسی لەسەرنیشتووە بەهۆی کافرییەکەیەوە. ئیبراهیم پـێی دە ڵێ: پێم نەووتی لەقسەم دەرمەچۆو گوێڕایەڵم بەبۆ ئەو فەرمانانەی خوا کەدوای لێدەکردیت.

باوکی دەڵێ: دەئێستا بەبێ فەرمانیت ناکەم - واتە لەقیلمتدا چونکە ڕاستیو گەورەیی پەروەردگاری بۆ دەرکەوتووە - و بەگوێت ئەکەم.

ئالێرەدا سۆزی ئیبراهیم دەجولێو ڕوودەکاتە پەروەردگارو دەڵێ: ئەی پەروەردگارە تۆ پەیمانت دامێ کەتوشی ڕوزەردیم نەکەی هەرگیز، دەیکام ڕوو زەردی لەوە گەورەترە کەحاڵی باوکمی درور لەڕەحمەتی تێدایە؟

خوای گەورە وەڵامی دەداتەوەو دەفەرمووێ: ئیبراهیم من بە بەهەشتم حەرام کردووە لەسەر کافران، پاشان پێی دەوترێت ئەی ئیبراهیم ئەوە چییە لەژێر قاچتدا سەیر دەکات، کەوا لاکێکی زۆر ناشرینی خوێناوی کەوتووە - کەباوکیەتی بۆیە لەوشێوەیەدا پیشانی دەدرێت بۆ ئەوەی بەزەیی پێیدا نەیەتەوە، پاشان چوارپەلی دەگیرێو فڕێ دەدرێتە ناو ئاگرەوە.

ئەوەیە عاقیبەتی ئەو باوکانەی کەناکۆکن لەگەڵ کوڕەکانیاندا لەسەر ئیسلام قسەیان پێدەڵێنو دەیانشکێننو ڕێگریان لێدەکەن، ئەو باوکانە ڕۆژی زیندووبوونەوەی گەورە ڕووزەرددەبن بەو کارانەی کەبەرامبەر بەڕۆڵە خواناسەکانیان دەیان کرد.

دەبێ یارمەتی دەریان بن لەسەر ئەو ڕێگە ڕاستو دروستە نەك ڕێگر،

، چونکە لەڕۆژی دوایدا باچاك بزانن ئەگەر ڕۆڵە خراپ ڕەوشت بێت لەپێشدا لەباوکی دەپرسێتەوە ئایا چاکت پەروەردەکردو لەگەڵیدا خەریك بوویت بۆ سەر ڕێگەی ڕاست؟

ئەگەر هاتو ئەو باوکە ئامۆژگاری کەریبوو ڕێنیشاندەری بۆ ڕێگەی ڕاست ئەوا لێپرسینەوەی قیامەتی لەسەر لادەچێت.

---

(١) رواه البخاری/ فتح الباری/ج٦/(ص: ٣٨٧)/دار الفكر

بەڵام ئەگەر بەپێچەوانەوە بوو لەرێ لادانی کورەکە دەبێتە دۆزەخێکی دوارۆژی بۆ هەردوکیان، لەبەرئەوە باوکانی موسوڵمان لەکاتی ئێستادا زۆر پێویستە کەرێ نیشاندەرو هاندەری منداڵەکانیان بن بۆ سەر رێگەی خوایی‌و هاتنە ناو مزگەوتەکان‌و تێکەڵاو بوونی ئیماندارانی رابوونی ئێستای ئیسلام.

ئەوسا لە دونیاو دوارۆژیشدا دەبێـە مۆمێکی پرشنگدارو لەخزمەت‌و باوك‌و دایکدا دەسووتێ، ئەمە حاڵی باوکی ئیبراهیم بوو لەگەڵیدا. گەلەکەشی زۆر چاکتر لەم وەڵامیان نەدایەوە بەڵکو کەوتنە ئازار دانیشی کەلەپێشوودا خستمانە بەردیدی خوێنەر.

پاش ئەمانە هەمووی بریاری رۆیشتن‌و بەجێهێشتنی (بابل) لەلایەن (ئیبراهیم)ەوە بەیرەوکراو کۆچی‌کرد بۆ وڵاتی (شام) بۆبەشی (بیت المقدس)[1]

کاتێك هاتنە ئەم شوێنە سەیر دەکەن برسێتی‌و نەبوونیەکی زۆر ئەم زەویەی داگیرکردووە، لەبەرئەوە کۆچیان کرد بۆ (مصر)[2]

قورئان لەم بارەیەوە دەفەرمووێ: ﴿فآمن له لوط ، وقال انى مهاجر الى ربى انه هو العزيز الحكيم﴾ (العنكبوت: ٢٦)

واتە: (لوط))[3] ی برازای باوەری پێهێنا پاش ئەوەی کەبەڵگەی پێغەمبەرایەتی‌و معجزەی نەسووتانی لێبینی، پاشان ووتی ـ ئیبراهیم ـ من دەرۆم بۆلای ئەو شوێنەی پەروەردگارمی لێ‌دەپەرستم بەتاك‌و تەنهای، بەراستی پەروەردگارم بەتوانایە کەلەدەست خراپی ئێوە بمپارێزێ‌و دانایەکە بۆ کوێم دەنێرێ.

ئیمامی پایەبەرز (فخرالدين الرازى) لەراڤەی ئەم فەرمودەیەدا دەفەرموێت:(لما بالغ ابراهيم فى الارشاد ولم يهتد قومه، وحصل اليأس الكلى حيث راى القوم الاية الكبرى (ولم يؤمنوا)، وجبت المهاجرة، لان الهادى اذا هدى قومه ولم ينتفعوا فبقائه مفسدة لانه ان دام على الارشاد كان اشتغالا بمالاينفع به)[4]

واتە: پاش ئەوەی کەئیبراهیم برێکی زۆر خەریك بوو لەگەڵیانداو رێگەی رۆشنی پیشان دەدان، بەڵام گەلەکەی هەر هیدایەتیان هەڵنەبژارد، وەبەتایبەتی لەو کاتەدا زۆربێ هیوا بوو

(١) قصص الانبياء/ابن كثير/(ص: ١٣٢)/الطبعة المحققة والمخرجة/

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو (ص: ١٣٣).

(٣) ئەو (لوطه)یەکە نێردرا بەپێغەمبەرایەتی بۆ سەر قەومی سدوم‌و برازای ئیبراهیم بەڵام لەم کاتەدا هێشتا نەکرابووە پێغەمبەر.

(٤) تفسير الكبير/للامام مخرالدين الرازى/ج٢٥ ـ ٢٦ (ص: ٥٤)جزء ـ ١ ـ

کەگەلەکەی (معجزە)ی ئەسووتانیشیان بینی کەچی هەرباوەڕیان نەهێنا کەچەندە ڕووداوێکی گەورەبوو، لێرەدا بەجێهێشتنیان بووە ناچاری‌و کارێکی (حەتمی)، چونکە ڕێپیشاندەر کاتێك زۆر خەریك دەبێت لەگەڵ گەلەکەیدا بەڵام هیچ سوودی نەبێ مانەوەی بێسوودە، لەبەرئەوەی ئەگەر هەر بەردەوام بێت لەسەر بانگخوازی‌و کەس نەبوو وەڵامی ئەم بانگەی بداتەوە، ئەوکات وەك کارێکی بێبەری لێدێت‌و هیلاك بوونێکی بێسوود.

هەروەها قورئان لەبەشێکی‌تردا باس لەم بەسەرهاتە دەکات‌و دەفەرموێت: ﴿ونجيناه ولوطا الى الارض التى باركنا فيها للعالمين﴾ (الانبياء: ٧١)

واتە: ئیبرایهم و لوطمان ڕزگارکرد لەدەستی تاوانکارەکانی گەلەکەیان بۆ ئەو زەوییەی کەخێرو بەرەکەت دارمان کردووە بۆ خەڵکی، واتە زەوی شام (الارض المقدسة).[1]

لەم کۆچ کردنەدا خێزانەکەی لەگەڵیدا بوو کەناوی (سارە) بووەو کچی مامی بووە لەگەڵ (لوطی)ی برازای‌و خێزانەکەشی.[2]

بەڵێ ئەمەیە ئەو زاتەی کەئیمانی داوای بەجێهێشتنی هەموو شتەکانی لێدەکات، یادگاریەکان، خزمان، ماڵو سامان، زەوی باوباپیران هەموویان نرخیان نیە ئەگەر ئیمان سەلامەت نەبێ.

مادام ئیمان کەوتە بەرهێرش‌و خەریکە زیانی پێدەگەیەنرێ دەبێ ئەمانە هەمووی بەجێبهێڵرێ، چونکە ئێمە هاتووین ئیمانمان سەلامەت بێت نەك شتەکانی‌تر.

جارێکی‌ترو لەم چیرۆکەدا ئافرەتان ڕۆڵە سەرەکیەکەی خۆیان دەبینینەوەو دەبنەوە تەواوکەری پیاو، (سارە) بۆ ئیبراهیم کۆڵەکەی ڕاوەستاوبوو، ئەو زاتە بوو کەهەنگاوەکانی ئیبرایهمی گەرم تر دەکرد، ئەو زاتەبوو کەبووە تاکە لەخۆگری هەناسە ساردەکانی ئیبراهیم.

ئێستای ئیسلامیش پێویستی بەچەندەها (سارە) هەیە، پیاوان تەنها باڵن ئەگەر ئافرەتان نەبن، ئیبراهیمەکان بێسارەکان ناتوانن ڕێبکەون‌و بڕۆن.

جوانترین پەروەردە لەقوتابخانەی ئەواندا دەبینین کەڕۆڵەی داهاتوو بۆ ئیسلام پەروەردە بکات، هەروەك چۆن (سارەو هاجر) سەرچاوەی پێغەمبەرانیان پەروەردەکرد (ئیسحاق‌و ئیسماعیل).

بەتایبەتی ئێستای ڕابوونی ئیسلامی ئەمڕۆی جیهان پێویستی بەباڵی دووەمی هەیە

---

(١) تفسير القران العضيم/ابن كثير/ج٣/(ص: ١٧٦)/طبعة منقحة.

(٢) قصص الانبياء/عبدالوهاب نجار/(ص: ٨٣).

کەخوشکانیان لەهەموو بوارەکانی کاردا، پێویستە یارمەتی دەری پیاوان بن چونکە ئەم ڕابوونەیە درێژکردنەوەی پەیڕەوی ئیبراهیم و محمد (عليهم السلام).

پێویستمان بەکۆچ کردنە بەڵام کام کۆچ کردن؟ کۆچ کردن لەنوستن بۆ بێدار ی، لەنەزانی بۆ زانیاری، لەوەستان بۆ جووڵە، لەتێرامان بۆ کارکردن، لەخەیاڵ بۆ ڕاستی.

ئەمە ویستی پەروەردگار بووە کەبەم شێوە پڕ لەحیکمەت بێت (پیاو لەگەڵ ئافرەت دوو باڵی تەواوکەری یەکتریبن ئەوەتا بەئاشکرا لەگەورەترین کاردا دەردەکەوێت کەئاوەدان کردنەوەی جیهانە (ادم، حواء).).

وەلە ڕۆژانەی ژیانی ئازیزمان (محمد) (ﷺ)دا دەردەکەوێت کەچۆن خێزانەکانی لەگەیاندنی ئەم پەیامی ئیسلامی‌یەدا ڕۆڵێکی گەورەیان هەبووە. ئەوەتا سەرەتای پەژارەکانو قورسایەکانی ئەم پەیامە خوایی‌یە (خديجه) (خوای لێ ڕازی بێت) بەجوانترینو بەرزترین ووشە لای دەبات لەسەر پێغەمبەر (ﷺ).

ئەوەتا پێغەمبەر (ﷺ) سەرەتای هاتنی نیگایە بۆیو لەئەشکەوتی (حراء) (جبريل) عليه السلام نیگای بۆ هێناوەو ڕوداوێکی نائاسای بەسەردا هاتووە، زۆرتر ساوە دەگەڕێتەوە بۆماڵەوە و دەڵێ: داملپۆشن، داملپۆشن، تاوەکو دێتەوە سەرخۆی ئەم بەسەرهاتە گەورەیە لای کۆڵەکەی ژیانی (خديجه) باس دەکات، وەکو بیەوێت ئەم هەمو قورسی‌یە بەسۆزی هاوسەری لابدات، دەڵێ ترسام لەخۆم کەناتەواوبم؟

ئالێرەدا گەورەترینو پڕماناترینو ئارامترین ووشەو پاڵپشتو مژدە ئاڕاستەی پێغەمبەر دەکرێ کەدەفەرمووێ: ((ابشر، كلا والله ما يخزيك الله ابدا، انك لتصل الرحم، وتصدق الحديث، وتحمل الكل، وتكسب المعدوم، وتقرى الضيف، وتعين على نوائب الحق..))(1)

واتە: مژدەبدە سوێندبێ بەخوا هەرگیز خوای گەورە توشی ڕوزەردیت ناکات، تۆ پیاوێکیت سەردانی خزمانو ئاشنایان دەکەیتو ڕاستگۆی لەگوفتارتداو لەگەڵ هەموودا باشیتو دەست گیرۆیی بێدەستان دەکەیت ڕێز لەمیوان دەنێیتو هەردەم لەسەر ڕاستی ئامادە دەکەیت.

ئەمە گەورەترین یارمەتی‌و دڵ ئارامکەرەوەیە بۆ مرۆڤ، بەخشینی متمانەبوونە بەخۆ سەرەکی‌ترین سەرچاوەی گەشبینیە بۆ پێغەمبەر (ﷺ). وەگەورەترین نمونەی جوانی‌و گەورەیی سۆزە بۆ خوشکان کەهەردەم ئەو تەواوکەرەی بەرامبەرەکەیان بن.

---

(1) شبهات واباطيل حول تعدد زوجات النبي/محمد علي الصابوني/(ص: ٣٦)/الحديث متفق عليه.

## کۆچ بۆ میسر

خوێنەری ئازیز.. پاش ئەوەی گەیشتینە ئەوەی ئیبراهیم (علیه السلام) زەوی بابلی بەجێهێشت لەگەڵ لوطی برازای و خێزانی هەردووکیان ڕوویان کردە وولاتی شام (بیت المقدس) (فلسطین). پاش ماوەیەکی کەم لەفەلەستین نەبوونی و نەداریەکی زۆر رووی کردە ئەو وولاتەکە ناچاری کردن کۆچ بکەن بۆ (میصر)[1]

کاتێك ڕوویان کردە ئەم وولاتەو بەنیازی نیشتەجێی بوون تیایدا، لەم وولاتەدا پادشایەك بەڕێوەی‌دەبرد کەهەندێك زانایانی مێژوو دەڵێن کەئەم پادشایە برای پادشای خوێن ڕێژ (ضحاك) بووە، و ئەو لەسەر میسر دایناوە.[2]

دەگێڕنەوە کاتێك کەدەچنە ئەم وولاتەوە هەواڵ دەبرێت بۆ پادشاکە، پیاو ژنێك هاتونەتە ناو شارەوە.

پادشاش کاتێك ئەم هەواڵە دەبیستێ دەنێرێ بەدوای ئیبرایهم داو لێ‌دەپرسێ کەئەم ئافرەتە چی‌یە لەگەڵتدا؟ ئەویش لەوەلآمدا دەفەرمووێ ئەوە خوشکمە!

- پاشا دەنێرێ بەدوای (سارە)ی خێزانی ئیبراهیم دا، ئالێرەدا ئیبراهیم دەڵێ ئەگەر لێ پرسیت ووتی تۆچی ئەو پیاوەیت؟

- لەوەلآمدا بڵێ خوشکیم چونکە من وام پێووتوەو بەردۆم مەخەرەوە.

پاشان سارە بانگ کرا بۆلای پادشا.

لێرەدا پادشای خوانەناس و کافر وویستی دەست درێژی بکاتە سەر بەلآم خوای گەورە کارێکی بەسەردێنێ کەخۆشی سەری سووڕدەمێنی لەسەری ئەویش ئەوەیە لەوکاتەدا دەستەکانی رەق دەبێت و گۆج دەبێت.

لەم بارە ناهەموارەدا ئەبێت بە(سارە) دەڵێ: دوعام بۆ بکە کە چاك ببمەوە هیچت لێناکەم.

(سارە)ش دوعا دەکات و چاك دەبێتەوەو وەك خۆی لێدێتەوە.

بۆ جاری دووەم هەر دەیەوێت کەدەست درێژی بکاتەوە سەری، ئەمجارەش خوای گەورە تووشی هەناسە توندی (صرع)و لرخە لرخی دەکات، ئەمجارەش بە(سارە) دەڵێت کەدوعام بۆبکە چاك ببمەوە ئەم جارەیان بەڕاستی وازت لێدەهێنم.

---

(١) مع الانبیاء/عفیف طیارە/(ص: ١٢٢).

(٢) قصص الانبیاء/ابن کثیر/(ص: ١٣٥) الطبعة المخرجة.

پاش ئەوەی کەئەم جارەش دوعای بۆ دەکات‌و چاك دەبێتەوە، هاوار دەکات - پادشاکە - لەدارو دەستەکەی‌و بانگیان دەکات‌و بەتووڕەبونێکەوە دەڵێ: ئێوە مرۆڤتان بۆ نەهێناوم، بەڵکو جنۆکەو شەیتانتان بۆ هێناوم لایبەن لەلام‌و بیبەنەوە بۆ ئیبراهیم‌و (هاجر)یشیان بدەنێ.[1]

پاشان (سارە) دەگەڕێتەوە بۆلای ئیبراهیم دەبینێ نوێژ دەکات‌و ناسۆری‌و ناخۆشیەکانی (سارە)ی خێزانی بۆ لای خوا (شکات) دەکات.

پاشان ئیبراهیم پرسیار لەسارە دەکات کەچی‌بووە؟

ئەویش بەخۆشحاڵی‌یەوە دەڵێ: خوای گەورە خراپی‌و پیسی ئەو کافرەی گەڕانەوە بەسەر خۆیداو بەسەر خۆیدا شکایەوە.[2]

ئیمامی (ابن حجر) لە(فتح الباري)دا حیکمەتی ئەوەمان بۆ باس دەکات کە بۆچی ئیبراهیم ووتی (سارە) خوشکمە، ئەویش بەوەی کەلەئیمامی (منذري)یەوە دەگێڕێتەوە لە (حاشية السنن) لەئەهلی کیتابەوە دەفەرمووێت: (انه كان من رأي الجبار المذكور ان من كانت متزوجة لايقربها حتى يقتل زوجها فلذالك قال ابراهيم هي اختي)[3]

واتە: بۆچوونی ئەو ستەم کارە - پادشاکە - وابوو، کەهەرکەس مێردداربوایە نزیکی نەدەکەوت تامێردەکەی نەکوشتتایە، لەبەرئەوە ئیبراهیم ووتی خوشکمە بۆ ئەوەی کەنەیکوژێ.

بەڵێ.. ستەم کاران هەردەم لەخەیاڵی هێرش بردنە سەر موسڵماندا بوون‌و هەردەم شوێن کەوتەی عەیب‌وعاریان بوون‌و، لەهەوڵی تێرکردنی هەواو نەفسیاندا بوون ئیتر باپادشای وولاتێکیش بێ کاتێك دوای ئارەزووی دەکەوێت دەچێتە شێوەی منداڵەوە، چۆن دەست دەبا بۆ پشکۆ وادەزانێ خواردنە.وەهەردەم بێ‌ئاگان لەوەی کەخوای گەورە هەردەم پارێزەری دواکەوتووەکانی پەیڕەوەکەیەتی هەروەك چۆن (سارە)ی پاراست.

لەهەندێ (ریوایە)تی تردا هاتووە کەخوای گەورە پەردەی لەنێوان ئیبراهیم‌و سارەدا نەهێشتووە بۆئەوەی دڵی ئارام بێت کەتووشی هیچ نابێت.[4]

---

(١) (هاجر): ئەوکاتە جاریەو ئیشکەری ئەو وەکیلەبووەو بەدیاری دلویەتی بەسارەو ئیبراهیم، دایکی پێغەمبەر (ئیسماعیل)ە، پاشان لەگەڕانەوەدا بۆ شام ئیسماعیلی دەبێت کەلەداهاتوودا باس لێوەدەکرێ ئینشاءالله.

(٢) فتح الباري/ابن حجر العسقلاني/ج٦ (ص: ٣٨٨)/دار الفكر.

(٣) فتح الباري/ابن حجر العسقلاني/ج٦ (ص: ٣٩٢)/دار الفكر.

(٤) قصص الانبياء/ابن كثير/(ص: ١٣٥)/الطبعة المخرجة.

## گەڕانەوەی ئیبراهیم بۆ شام و لەدایك بوونی ئیسماعیل

ئازیزان پاش ئـەوەی کەئیبراهیم و سارە خوای گـەورە پاراستنی لەدەستی پادشـای زۆرداری ئەو سەردەمە،و هاجریشیان پێدرا (ابن کثیر) دەفەرمووێت:(ثم ان الخليل رجـع مـن بلاد المصر الى ارض التيمن، وهى الارض المقدسه التى كـان منـها، ومعـه انعـام وعبيـد ومـال جزيل، وصحبتهم هاجر القبطيه المصريه)[1]

واتـە: لەپاشـاندا ئیــبراهیم گەڕایـەوە بـۆ وولاتــی (فلسـطین) ـ کەلـەوەو پێـش لێی نیشتەجێبوو بـوو بـەهۆی نـەبوونی زۆرەوە بـەجێی هێشـتبوو لـەم گەڕانەوەیـەیدا زۆرێـك لەئاژەڵ و بەندەو سەروەت و سامانێکی زۆری پێدابوو. وەهاجەریشیان لەگەڵدابوو.

بـەڵێ.. گەڕانـەوە بۆ وولاتـی شـام و کۆمـەڵێك سـەروەت و سـامانیان پێبـوو، ئـەوەبوو بەفەرمانی ئیبراهیم هەرچی بەشی (لوطی) برازای هەیە درایەوە بەخۆی و لەشاری (سـدوم)[2] لەگەڵ خێزانیدا دامەزراو نیشتەجێبوو.

ئیبراهیم هیچ منداڵێکی نەبوو لە(سارە)ی خێزانی و تەمەنیشیان بەتـەواوی پـیربوو بـوو، لەبەرئەوە ئیبراهیم زۆر ئامەزرۆی منداڵێك بوو کەخوای گەورە پێیببەخشێ.

ئەم منداڵ نەبوونە وادەردەکەوێت کەلە(سارە)ی خێزانییەوە بـووە بۆیـە پـاش ئـەوەی کەنیشتەجێ دەبن لەشام (سارە) بە ئیبراهیم دەڵێ: بچێتە لای (هاجر) بەڵکو خـوای گـەورە لەو منداڵێکی پێببەخشێ پاش ئەوەی کەدەیهێنێ و دەیکاتە خێزانی دووەمی.

بەڵێ خوای گـەورە ئـاوات و ئامانجەکـەی پێغەمبـەری خـۆی دێنێتـەدی و (ئیسـماعیل)ی پێدەبەخشێ .[3]

قورئان لەم بارەوە دەفەرمووێت ئیبراهیم ووتی:﴿رب هب لى من الصالحين﴾ (الصافات: ١٠٠)

واتە: خوای گەورە پێم ببەخشە منداڵێك لەصالحان و بۆ خوا گونجاوان.

خوای گەورەش وەڵامی ئەو داواکاریەی دایەوە کەخۆی دەفەرمووێت ﴿فبشرناه بغـلام حليم﴾ (الصافات: ١٠١)

واتە: مژدەمان پێدا بەمنداڵێك، بە کوڕێکی ژیرو خاوەن ئارامی زۆر.

---

(١) قصص الانبياء/ابن كثير/(ص: ١٣٦)/الطبعة المخرجة.

(٢) سدوم: شارێکی کۆنە لەفەلەستین لەسـەر قـەراغی دەریـای سـوور، شـاری قەومەکـەی لوطـە کـەخوای گەورە وێرانی کرد بەسەریاندا. ئەم بەسەرهاتە لە (قصص ابن کثیردا) باس کراوە (ص: ١٣٦).

(٣) مع الانبياء/عفيف طبارة/(ص: ١٢٢).

ڕاستی خوایەتی (الله) ئەمەیە، هەموو شتێکی لێداوا دەکرێ وەبەتواناشە لەسەر هێنانەدی بۆ داواکار، خوایەتی بەم شێوەیە دەبێت لەکام شت گرانە، لەکام شوێندا نارەحەتە، لەکام کاتدا کەناسۆرە، داوای لێبکرێ دێت بەدەم بەندەوەیەوە، گەورەترین و جوانترین دیاری، منداڵێك... کەهەموو مرۆڤایەتی ناتوانێ تەنها ئەندامێکی بەدی بهێنێ، ئەمەیە پەروەردگار، شوێنەواری دەسەڵاتی گەورەیی زاتی دەسەلمێنێ، هەموو گەورەیەکیش شایەنی ستایشە.

بۆ ئەوانەی کەخوای گەورە لەسەر نەبوونی منداڵەوە بیرناکەنەوە کێهەیە جگە لەخوای گەورە پێیان ببەخشێ، بۆچیتر ڕووناکەنە زاتێك کەدیاریەکی پێبەخشیوون لەتوانای مرۆڤایەتیدا نیە پێشکەشیان بکات.

## پەندو ئامۆژگاریەکانی بەندی چوارەم

(١) پەیامی خوایی بریتیە لەو پەیڕەو پرۆگرامەی کەبۆ هەموو تاکەکانی کۆمەڵ هاتووەو پێویستە هەوڵ دبرێ کەبگەیەنرێتە هەموو تاکەکان ئیتر لەسەپانێکەوە تاپادشایەك، هەروەك چۆن ئیبراهیم بەپادشای سەردەمی خۆی گەیاند.

ئەمڕۆهەڵگرانی پەیامی خوایی و بانگخوازان بۆلای دینی خوا پێویستە ئەم ڕاستیە باش بزانن و هەردەم و بەهەموو تاکەکانی بگەیەنن بچوکترینی فرسەت بدۆزینەوە بۆ گەیاندنی ئەم ڕاستیە بەخاوەن دەسەڵاتان.

چونکە ئەمە فەرمانێکی خواییەو بەپێغەمبەرەکەی داوەو بۆ دواکەوتوانیشی: ﴿كتاب انزل اليك فلايكن في صدرك حرج لتنذر به وذكرى للمؤمنين﴾ (الاعراف: ٢)

واتە: پەرتووکێك و پەیڕەو پرۆگرامێکمان بۆ ناردویت، دڵتەنگی و قورسای ڕووت تێناکات و لەدڵتدا نەبێت بۆئەوەی خەڵکی پێئاگاداربکەیتەوە لەڕۆژی دوایی و سزای خوای و بیکەیتە یاد خستنەوەش بۆ ئیمانداران.

بەم دەقە قورئانیەدا مانایەکی ڕوون و ئاشکرای بانگەوازی خوایی دەردەکەوێت کەماهیەتەکەی بریتیە لە ئاگادارکردنەوەی هەموو لەڕێ لادەرێك و یادخستنەوەی هەموو ئیماندارێك.

مانای لەپێشدا مەبەست لەهاتنی ئەم پەیامە خواییانە بریتیبوو لەئاگادارکردنەوەی لەڕێلادراوان کەزۆربەیان دەسەڵات دارن.

(۲) ئەم بەشە لەچیرۆکی ئیبراهیم (عليه السلام) گەورەترین‌و دیارترین پەندی تێدایە بۆ دەسەلأتداران لەهەمو کات‌و شوێنێکدا.

ئەویش بریتی‌یە لەوەی کەهیچ کات، نەفس‌و دەسەلأت‌و تەختی زۆر توشی لەخۆبایبوونیان نەکات‌و لووت بەرزیان نەکات لەئاستی خوایاندا. چونکە هەرچەندە دەسەلأت لەبەرچاوی مرۆڤەکان گەورەبن لەبەرامبەری دەسەلأتی خوایدا بچووکن‌و بێ‌تەرزشن.

بۆ پەند لەبەسەرهاتی ئیبراهیم وەرناگرن؟

هەموو سەر زەوی‌و چواردەوری‌و هەموو دەسەلأتی (نەمرود) دژی وەستا بەلأم لەبرامبەر هێزی خوایدا هەموویان وەك پەتی (جالّجالّۆکە وابوون)[1]

ئەی بەچۆك داهاتنەکەی (نەمرود) لەبەردەم ئیبراهیم دا کاتێك وتی من خوام! دەژێنم‌و دەمرێنم؟

دوای هەموو ئەم لووت بەرزییانە چۆن دێت بەچۆکدا، بێ‌دەسەلأتی خۆی بۆ دەردەکەوێت.هەردەم دەسەلأتداران پێویستە ڕاستی‌یەك چاك بزانن‌و لەیادی نەکەن‌و لەناو جەرگەی بیریاندا هەردەم بدرەوشێتەوە، ئەویش ئەوەیە کەکاتێك هاتنە دوونیا بەڕووتی هاتن، وەکاتێکیش دەڕۆنەوە تەنها چەند (مەترێك) خامی سپی دەبەن لەگەڵ خۆیاندا.

ئیتر دەسەلأت‌و سامان‌و خزمانی زۆر هیچ سوودیان نیە هەروەك پەروەردگارمان دەفەرموێت: ﴿يوم لاينفع مال ولابنون﴾

واتە: ڕۆژێك کەماڵ‌و منداڵ سوودیان نیە.

- بۆ مسۆگەکردنی ئەو ڕۆژە کام بەرنامەیان لەبەردەمدایە؟

- کام کاریان بۆ کردووە؟

بارەکەیان زۆر گەورەیە ئەگەر ئاگاداری خۆیان نەبن؛ بالەدوونیادا خۆش بژین بەچی دەچن؟ ژیانی نەبڕاوە بەتووڕەیی‌یەوە چاوەڕوانیانە.

ئای چەندە ترسناکە ئەو دەقە قورئانی‌یە پیرۆزەی کەدەفەرموێت: ﴿ومن لم يحكم بما انزل الله فأولئك هم الفاسقون﴾ (المائدة: ٤٧)

واتە: هەرکەس بەفەرمانی خوای‌و پەیڕەوی پەروەردگار کارنەکات‌و پەیڕەوی ژیان نەبات بەڕێوە، ئەوا بەڕاستی ئەوانە، فاسقەکانن.

بادەسەلأت داران باش چاوێك بخشێننەوە بەکاری بەڕێوەبردنیاندا.. بزانن چەندی

---

(۱) بۆ زیاتر تێگەیشتن‌و دڵنیابوون لەدەسەلأتی خوای، سەیری تفسیری (في ظلال) بکە ج٦

بەوشێوەیە کەخوا بەرنامەی بۆداناوەو چەندیشی ئەم دەقە بەسەریدا دەچەسپێ.

باجارێکیتر گوێڕایەڵی فەرمودەیەکی پێغەمبەربن (ﷺ): ((مامن عبد یسترعیه، یموت وهو غاش لرعیة، الا حرم الله علیه الجنة)).[1]

واتە: هیچ بەندەیەك نیەکە کۆمەڵێکی پێبسپێرێ کەبیان بات بەڕێوەو سەرگەورەیان بێت، کاتێك کەدەمرێت ئەگەر مافی نەپاراستبن و فێڵی لێکردبێتن.

بەرامبەر بەمانە هەمووی خوای گەورە بەهەشتی لەسەر حەرام دەکات.

ئەوە ووتەی (صادق الامین)ە، تەنها ئەوەی لەسەر بوو پێی گەیاندوین ئیتر کام لەدەسەڵاتداران کاری پێدەکات ئەوە باوەڕی بەخاوەن وتەو خوای خاوەن وتە هەیەو ئەوەش کاری پێناکات بێگومان بەقەد ئەو کەسەر (ژیرە)کە، بەیانی سەفەرێکی دووروودرێژو زەویەکی (لماوی) ووشکی لەبەردەمدایە کەزۆر نارەحەتی دەکات، کەچی هەوڵی هەلگرتنی بەلایەنی کەوە چەندێك نان و ئاو نادات!!!

ئیمام (ابن قیم جوزی) لەبارەی مرۆڤ و ماڵ و منداڵ و کردەوەیەو نموونەیەکی بەرز دەهێنێتەوە کەدەفەرموێت: نموونەی مرۆڤ و ماڵ و منداڵ و کردەوەکانی وەك پیاوێك وایە کەسێبرای هەبێت.

پاشان دەچێتە سەفەرێکی دوورو درێژو ناخۆش، لەم سەفەرەدا هاواردەکات لەهەر سێ براکەی واتە: ماڵ و منداڵ و کردەوە - و پێیان دەڵێ: ئەوەتا لەم حاڵەدام کەدەبینن و زۆر نارەحەتم و لەهەموو کات زیاتر لێرە پێویستم بەئێوەیە بێن بەهانامەوە.

لێرەدا یەکەمیان - ماڵ - وەلامی دەداتەوەو دەڵێ: من برات بووم تانەهاتبوویتە ئەم سەفەرە!! ئیتر لەم ساتە بەدواوە برات نیم!! پاشان هاوار لەبرای دووەمیان دەکات - منداڵ و عەشیرەت - ئەویش وەلامی دەداتەوەو دەڵێ: منیش برات بووم هەتا ئەوکاتەی کەئامادەم کردی بۆ ئەم سەفەرە، بەلام لێرەدا بەهیچ جۆرێك برایەتیت ناکەم و توانای یارمەتیدانی تۆم نیە.

ئالێرەدا کابرا بەناسۆریەکەوە دەڵێ: بەڕاستی برایەکی خراپ بوون و لێرەدا هیچ باشەیەکتان پێنەگەیاندم و نەهاتن بەهانامەوە.

پاشان لەکۆتایدا بانگ دەکات لەبرای سێهەم - کردەوەکان - و پێیان دەڵێ ئەی تۆ یارمەتیم نادەی؟

---

(١) رواه البخاري (٧١٥٠).

برای سێهەم کەکردەوەکانیەتی لەدوونیادا لەوەلاَمی دەداتەوەو دەڵێ: من هاوەڵت بووم لەلەش ساغیتداو لەنەخۆشیتداو ئێستاش هەر هاوەڵو برانم، وەلەگەڵتدا بووم کەسواربوویت بۆئەم سەفەرە، وەلە ڕێگەشدا هەرهاوەڵو براتمو بۆ کوێ گەیشتی ئەوا لەگەڵتدام وەهەردەم لەهەموو شوێنێك لەگەڵتدامو لێت جیانابمەوە ! !

ئالێرەدا کابرا دەڵێ: بەڕاستی تۆ باشترینو چاکترین هاوەڵو برایەك بوویت بۆ من، کەچی من نەزان بووم زیاتر (فضلی) ئەو دوانەی ترم دابوو بەسەر تۆدا، خۆزگە وەختی خۆی لەدوونیادا هەقی تۆم بزانیایەو زۆرتر لەگەڵتدا خەریك بوومایە.[1]

دەی باخەڵکی بەگشتیو دەسەلاَتداران بەتایبەتی ڕێزی ئەم هاوەڵەیان برگن چونکە لەو سەفەرە ناسۆرەدا تەنها ئەو دێت بەهانایانەوە.

باچیتر دەسەلاَتدارەکان (نەمروود) ئاسا نەبنو پەیڕەوی کۆمەڵگەیان بەشێوەیەك بکەن کەخاوەنی هەموو دەسەلاَتەکان دەیەوێت بەڵکو لەڕۆژی دوایدا ببنە یەکێك لەو کۆمەڵە کەسەی کەلە ڕۆژی دوایدا لەژێر سێبەری خوای گەورەدان کەهیچ سێبەرێك نیە تەنها سێبەری ئەونەبێت.[2]

(٣) خاڵێکیتر لەپەندو ئامۆژگاریەکانی ئەم چیرۆکە پەیوەست دەبێت بەبانگ خوازانەوە، ئەویش ئەوەیە کەبانگخواز هەردەم دەبێت لەکاتی کاری بانگخوازیدا شێوەی گفتوگۆو مامەڵەکردنی لەگەڵ بەرامبەردا بەشێوەیەکی ڕوونو ئاشکرابێت، واتە بەرامبەر لێی تێبگاتو وەریبگرێت.

لەوانەیە خوێنەری بڵێ: ئەم خاڵە پەیوەندی چیە بەباسەکەوە؟

ئەوا بۆ وەلاَمی ئەم پرسیارە دەچینە خزمەت کلیلی زانیاریەکانی قورئان مفسری بەرز ئیمام (فخرالدین الرازی) کەدەفەرمووێت: (لەوانەیە یەکێك بپرسێ بلێ لەزۆر شوێن لەقورئاندا خوای گەورە باسی مردنی پێش زیندووکردنەوە کردووە وەك ﴿كيف تكفرون بالله وكنتم امواتا فأحياكم﴾ وەلە شوێنێکیتردا ﴿الذي خلق الموت والحياة﴾ وەلەشوێنێکیتردا ﴿والذي يميتني ثم يحيين﴾.

---

(١) عدة الصابرين وذخيرة الشاكرين/للعلامه ابن قيم الجوزية/(ص: ٢٣٦).

(٢) ئەم ووتەیە مانای فەرموودەیەکی پێغەمبەرە (ﷺ) کەدەفەرمووێت ((سبعة يظلهم الله في ظله يوم لاظل الا ظله: امام عادل...)) تاکۆی فەرموودەکە کەبخاری (٦٦٠)و مسلم (١٠٣١) ڕیوایەتیان کردووە.

لەم دەقانەدا هەمووی مردن پێش زیندووبوونەوە کراوە ئەی بۆچی ئیبراهیم لەگەڵ (نمروددا) دەڵێ (ربی الذی یحی ویمیت)و زیندوکردنەوە پێش مردن دەکات؟

پاشان ئیمام (فخر) دەڵێ وەڵامەکەی ئەوەیە:

(المقصود من ذکر الدلیل اذا کان هو الدعوة الی الله تعالی وجب ان یکون الدلیل فی غایە الوضوح، ولاشك ان عجائب الخلقة حال الحیاة اکثر، واطلاع الانسان علیها اتم، فلا جرم وجب تقدیم الحیاة مهنا فی الذکر)[1]

واتە: مەبەست لەهێنانەوەی بەڵگە ئەگەر بۆ کاری بانگخوازی بێت بۆلای خوا؟ ئەوا پێویستە ئەو بەڵگانەی کەدەیهێنینەوە لەوپەڕی ڕوونیو ڕۆشنیدا بێت، واتە بەرامبەر تێی بگاتو ئاڵۆز نەبێت بەلایەوە، وەگومانی تێدانیەکە نهێنیەکانی دروست کردن لەژیانی مرۆڤدا زۆرترە، وەك لەمردن، وەمرۆڤ لەبەرچاویداو دەیبینێ باشتر لەوەی کەمردنو دوای مردن ببینێ، لەبەرئەوە پێویست بوو کەئیبراهیم لەم شوێنەدا، باسی ژیانی بخاتە پێش مردن، چونکە (نەمروود) واتێ دەگەیشت.

بەڵێ...لەم ووتانەی ئیمام (فخرالدین)دا کۆمەڵێك لەپەندو ئامۆژگاری باش دەردەکەوێت کەدەبێت بانگخواز ئەو ڕوونیو ڕۆشنیە لەووتەیدا هەبێت لەگەڵ بەرامبەردا.

بەتایبەتی ئەمڕۆی ڕابوونی ئیسلامی زۆر پێویستی بەم ڕوونیە هەیە لەگوفتارو ڕەفتاریدا، چونکە زۆرێك ئەوەمڕۆی بەدەووریدا دروست کراوەو لەهەموو لایەکەوە گوماناوی دەکرێ.

لەلایەکی ترەوە هەردەم خەڵکی ڕاستیو ڕوونی لەبەرچاوگەشو دیارە.

(٤) کۆچ کردنی ئیبراهیمو بەجێهێشتنی هەموو یادگاریەکانی ژیانی گەورەترینو بەرزترین نموونەی بانگخوازیو گەورەی نرخی ئیمان دەردەخات.

ئەوە دەردەخات کەسەلامەتی ئیمان زۆر لەپێش سەلامەتی جەستەوەیە ، هەموو کارێك دەبێت بکرێت لەخزمەتی پاراستنو خزمەت کردنیدا لەبەرئەوەی ڕزگارکەری خاوەنەکەیەتی لەڕۆژێکدا ﴿یوم لاینفع مال ولا بنون الا من اتی الله بقلب سلیم﴾.

سەلامەتی دڵیش بەئیمان نەبێت بەهیچ شتێکیتر نیە.

ئیبراهیم لەبەر خۆشحاڵی جەستەیو پاراستنی ژیانی کۆچی نەکرد بەڵکو تەنها مەبەست لەم کۆچ کردنەدا بریتیبوو لەپاراستنی ئیمانو سەرکوت نەکردنەوەی بەئازادی بەندایەتی کردنی.

---

(١) تفسیر الکبیر (مفاتیح الغیب)/للایمام فخرالدین/ج(٧ ـ ٨) (ص: ٢٤).

هەروەك مامۆستای پایەبەرزی ئیسلام (سید قطب) دەفەرموێت:(انه لم يهاجر للنجاة.. ولم يهاجر إلى أرض أوكسب أو تجارة، إنماهاجر إلى ربه متقربـا لـه ملتجـاء إلى حمـاه هـاجر إليه بقلبه وعقيدته قبل أن يهاجر بلحمه ودمه، هاجر إليه ليخلص له قلبه ويخلص له كيانه كله في مهجره)[1]

واتە:كۆچی نەكرد بۆ ئەوەی بحەوێتەوەو ڕزگاربێ، یاخود كۆچ بكات بۆ بەدەست هێنانی ماڵو كاسبی! بەڵكو كۆچیكرد بۆلای پەروەردگاری بۆ نزیك بوونەوە لێیو خۆدانە پاڵ مۆڵگای سۆزی،

كۆچیكرد بۆلای پەروەردگاری بەدڵو باوەڕیەوە پێش ئەوەی كۆچ بكات بەجەستەو خوێنی، كۆچیكرد بۆ ئەوەی تەنهاو بەتەنها ئەو بپەرستێتو كەسیتر، دڵی تەنها بۆ ئەوبیێو هەموو ژیانی تەنها بۆ ئەو پەروەردگارە كۆبكاتەوە لەو كۆچەدا.

بەڵێ... دەبێت هەموو كارەكان لەبەر خاتری پەروەردگاربێتو بۆ ئەو بێتو تەنها ڕەزامەندی پەروەردگاری تێدابێت.

ئیبراهیم دەیتوانی پەشیمان ببێتەوەو كۆچ نەكاتو جەستەی سەلامەت بێت، بەڵام ئایا كردی؟

- محمد (ﷺ)، كاتێك كۆچیكرد بۆ (مەدینە) لەبەرخاتری جەستەی نەڕۆی بەڵكو هەموو خۆشیو باشی دوونیای خرایە بەردەمی كەواز لەم بانگە بهێنێو كۆچ نەكات بەڵام هەركردی چونكە لەو شوێنەدا ئیمان سەربەستی خۆیی بەدیدەكرد.

ئەمڕۆی شوێن كەوتوانی ئیسلامیش، هەردەم دەبێت ئەمە بۆچوونو هەستیان بێت لەكام دانیشتن؟ لەكام شوێن؟ لەگەڵ كێ؟ چۆنی؟ بەچی؟ ئیمان كەم دەكاتو زەرەردار دەبێت بۆ ئیمان ئەوانە جێی بهێڵنو كۆچی لێبكەن[2]

وەبەهەمان شێوە لەهەركام لەمانەدا هەست بەزیادبوونی ئیمانو سەربەستی ئیمان كرا ئەوا بەردەوام بێت لەسەریو خۆشحاڵ بێت كەئیمانەكەی لەسەلامەتیدایە ئەمڕۆش لە هەموو شتەكان زیاتر پێویستیمان بەكۆچ كردنە لەتاوان نەك لەوڵاتمان چونكە سوپاس بۆ خوا گەلەكەمان خوای خۆی ناسیوەو پێغەمبەری خۆی هەڵبژاردووە..

---

(١) فى ضلال القرآن/سيد قطب/ج٦/(ص: ٤٠٥)/بيروت لبنان.

(٢) ئەم وتەیە ئەوە ناگەیەنێ كەمرۆڤ كەنارگیر بێ بەڵكو دەبێت پزیشكی نەخۆشیەكان بۆ چواردەوری، بەڵام ئەگەر بەهیچ ڕێگەیەك چارە نەماوە كە ئیبراهیم بەسەری هات، پاشان ببێتە پزیشك لەناو كۆمەڵێكی تردا.

(٥) بەرێکردنی کاروانی دینداری لەسەرەتای هاتنیەوە ـ واتە لەئادەم (علیه السلام)ەوە تا ـ محمد ـ (ﷺ) ـ جێدەستی ئافرەتانی تێدا دیارەو ئاشکرایە.

ئەوەتا گەورەترین کارێك کەئاوەدان کردنەوەی زەوییە بەتەنیا بە(ئادەم) ناکرێ ئەگەر (حواء) نەبێت.

ـ ئیبراهیم لەگەڵ (سارە) نەبێت کۆچ ناکاتو هەروەها.

ـ (ایوب) (علیه السلام) ـ لەکاتە ناسۆرەکانی ژیانیدا کەهەموو خەڵکی پشتی لێهەڵ دەکات خێزانی بەلایەوە دەبێ.

ـ محمد (ﷺ) زۆربەی ژیانی خێزانەکانی گەورەترین یارمەتیدەری بوون بەتایبەتی (خدیجەو عائیشە) (رضي الله عنهما).

ـ زۆرێك لەهاوەڵان خێزانەکانیان گەورەترین تەواوکەریان بوون وەك (رقیە) خێزانی (عوسمانی کوڕی عەفان) کەکۆچی لەگەڵدا دەکات بۆ حەبەشە.

ئەم مێژووە ئەوە دەسەلمێنێ کەهەردەم دینداریو بانگخوازیو خزمەت بەم بەرنامە خواییانە، باڵندیەکە دووباڵەکەی پیاوانو ئافرەتانن

بەتایبەتی ئەمڕۆی ڕابوونی ئیسلامی پێویستی بەچەندەهای لەوجۆرە هەیە کەببنە هاوشانی براکانیانو بێنە مەیدانی خزمەت کردنی ئیسلام، بەداخەوە ئێستاش زۆرێك لەموسڵمانان واتێدەگن کەئەم کارە لەسەرشانی خوشکان نیە؟!!

کەئەمەش بێئاگاییە لەدەقێکی ووتەی خوای پەروەردگار کەدەفەرموێت:
﴿المؤمنون والمؤمنات بعضهم اولياء بعض﴾

واتە: ئیمان داران لەنێرو لەمێ یەکتری تەواوکەرنو یارمەتی دەری یەکترن.

ئایا گەورەترین یارمەتی دان ئەو یارمەتییە نیە کەبۆ سەرکەوتنی دینی خوایە؟ هەروەك چۆن چەند زاتێك لەئافرەتان لەسەردەمی پێغەمبەری ئیسلامدا (ﷺ) نواندیان، نموونەی یەکەم شەهیدی ئیسلام (سمیە) خوای لێڕازیبێت، کەدەبێتە یەکەم قوربانی لەپێناوی پەیرەوی خوایدا.

(٦) ئەو مرۆڤانەی لەژیانی دوونیادا بانگیان لێدەکرێ بۆلای پەیرەو پرۆگرامی خوایی، بەڵام وەڵامیان نیەو بەڵکو لەزۆرکاتدا دژایەتیشی دەکەن، لەڕۆژێکی ترسناکی وەك ڕۆژی دواییدا حاڵیان لەحاڵی باوکی ئیبراهیم باشتر نابێت.

بەڕاستی نامۆیە، خەڵکی چاكو باش دەزانن کەئەگەر لەم ژیانی دنیا کورتوکەمەدا

بەگوێی پـەیڕەوی خوایی نەکەن و نەچن بەڕێوە، ئەوا ژیـانێکی هـەتا هـەتای لەناسۆری و نارەحەتی‌دا ئەبن، بەڵام هەر پشت هەڵدەکەن!!.

- کام لـەو خەڵکانە حـەز دەکـات لـەڕۆژی دوایـدا بپارێتـەوە بڵـێ: خـوای گـەورە تەنها ئەمجارە بمگێڕەوە ئەوا چاکە دەکەم و باش دەبم، بەڵام گەڕانەوە نەبێت.

- کام مرۆڤ دەتوانێ چەند چرکەیەك پشـکۆیەك لـەناو دەستەکانیدا ڕابگرێ و بەرگەی گەرمیەکەی بگرێت؟

- کام لەئێمە دەتوانـین ڕۆژێك هـەتا ئێـوارە لەبـەردەم سـوورەی هـەتاودا بووەسـتین؟ لەکاتێکدا کەتەنها ڕۆژێکی قیامەت پەنجا هەزار ساڵە!

بەڕاستی خەڵکی لەغەفڵەتدا دەژین و بێ ئاگان لەو ڕۆژەی کـە چاوەڕێیانـەو بـەڕۆکیان دەگرێ ﴿اقترب للناس حسابهم وهم في غفلة معرضون﴾ (الأنبياء :١)

بەتایبەتی خەڵکانی ئەمڕۆی جیهان ئەگەر وەڵامی ئەو هـەموو بانگخوازانـە نەدەنـەوە ، ئەوا بەڕاستی‌ی لای پەروەردگار هیچ جۆرە بیانوویەکیان نامێنێ ، چونکـە سـوپاس بـۆ خـوا ئەمڕۆ لە هەموو مزگەوت وماڵێکدا بانگخوازان هاوای لەخـەڵکی دەکـەن بـۆلای دینـی خـوا و ڕزگاریان دەکەن لەنەهامەتیەکانی ئەو ڕۆژە ناسۆرە.

جاهەرکـەس دەیـەوێت ڕز گـاری بێـت لـەو ڕۆژە ناهـەموارە و عاقیبـەتی وەك بـاوکی ئیبارهیمی لێ بەسەر نەیەت ئەوا باوەڕی بانگخوازانی ڕێگەی خوا بداتەوەو لەڕۆژی دواییـدا لای پەروەردگاری سەر بەرز بێت .

﴿اتبعوا ماأنزل إليكم من ربكم ولاتتبعوا من دونه أولياء قليلا ماتذكرون﴾(الأعراف: ٢)

٧- خاڵێکی‌تر لەم بەشە چیرۆکە ڕاستیەکی زۆر گەورە دەردەخات لەڕۆژانی ژیانی مرۆڤ دا ، کە بریتی‌یە لە پەنابردنە بەر هۆکارەکان و پاشان پشت بەستن بە خوای گەورە .

ئیبراهیم کاتێك کۆچی کـرد بـۆ وڵاتـی شـام بینـی کـەقات و قڕیـە و بـێ ڕۆزیـی‌ی ڕووی تێکردووە ، نەیووت ئیتر من لەم شوێنەدا دەمێنمەوە هـەتا خـوا شتێکم بـۆ دەکـات !!! ، بەڵکو هۆکاری گرتەبەرو کۆچی کرد بۆ میسر ، ئەمەش ئامۆژگـاری و پـەندێکی زۆر بـەنرخی تێدایە بۆ ئەمڕۆی ڕابوونی ئیسلامی و موسڵمانان کـە بەهـەموو توانایەکیانـەوە هۆکارەکـانی ماددی بگرنەبەر بۆ خزمەت کردنی بانگەوازی خوایی و ڕۆنـەچن لـەمانای (توكـل علـى الله) ، (قضاءو قدر) داو بڵێن ئەمە قەدەرە دەبێ وابێ .

ئەم جۆرە هەستە پیلانی دوژمنـانی دینـی خوایـەو نـەمامی ڕۆوێـنراوی دەسـتی ئەوانـە لەکێلگەی بیری موسڵمانان دا[1]

(٨) داواکـردن و پاڕانـەوە لـەخوای گـەورە پیشـەی ئیمـان دارە پێویسـتە ئـەو ئیمانــە درووست ببێت بۆ موسڵمان کە کام شتێك زۆر گرانەو مــرۆڤ توانـای بەدیهێنانی نیـە ، ئـەوا بەداوا کردنێکی بەکوڵ لەخوای گەورە دێتە دی .

هەروەك چۆن خوای گەورە ئیسماعیلی بەخشی بەئیبراهیم (علیهم السـلام) ، کەهـەرگیز لـەژێری مـرۆڤ داو لـەتوانای مـرۆڤ دانیـە ، پێویســـتە بـــەندەکان بەگشـتی و بــانگخوازان بەتایبەتی ئەو ڕاستیە بزانن کە هیچ کام لەشتەکان لای خوای گەورە گران نی‌یەو ، ئەوانـەی کە هیواو ئاواتیان لەدڵ دایە بەڕاستی و بەپاکی داوا لە پەروەردگاریان بکەن و ڕ است گۆبـن لەگەڵیدا ، ئەوا هەموو ئاوات و ئامانجێکیان بۆ دێنێتە دی و بێ ئومێدیان ناکات .

---

(١) بۆ زیادە تێگەیشتن لەم پیلانە سەیری ( اجنحة المکر الثلاثة) بکە - عبد الرحمن حسن حنبکە المیدانی ص ٢٦٠-٢٦٦ چاپی ١٩٩٤

# بەندی پێنجەم

## کۆچ کردنی هاجەرو ئیسماعیل (علیه السلام) بۆ مەککە.

ئازیزان.. پاش ئەوەی کە ئیبراهیمو سارەو هاجەر، بەمەڕوماڵاتەوە گەڕانەوە بۆ شامو خوای گەورە ئیسماعیلی بەخشی بە ئیبراهیم لە هاجەر، پاش ماوەیەك سارەو هاجەر هەندێ ناخۆشی لە نێوانیاندا درووست بوو، ئەویش بەوەی کە هاجەر منداڵی بوو بەڵام سارە نەزۆك بوو.[1] لەبەر ئەوە سارە داوای لە ئیبراهیم کرد کە بیگوێزێتەوە بۆ شوێنێکی ترو لەبەرچاوی نەیهێڵێت.

بەڵێ.. ئیبراهیم(علیه السلام) هاجەرو ئیسماعیلی(علیه السلام) هەلگرتو کۆچی پێ کردن بۆ مەککە، کە ئەوکاتە زەویەکی ووشك و بێ ئاو بوو، هیچ کەسێکی لێ نیشتە جێ نەبوو[2] وە کە ئەوکات ئیسماعیلیش شیرە خۆرە بوو.

پاشان لە شوێنی ئێستای کەعبە نیشتە جێی کردن، و بەجێی هێشتن، لێرەدا هاجەر دوای ئیبراهیم دەکەوێو هاواری لێ دەکات:

بۆ کوێ دەڕۆیو بەتەنها بەجێمان دەهێڵی لەم شیوە چۆڵەدا؟ چەند جارێك ئەمەی دووپارە کردەوە، بەڵام ئیبراهیم هەر وەڵامی نەدەدایەوە.

پاشان هاجەر ووتی: ئایا پەروەردگارت ئەم فەرمانەی پێ کردویت؟

ئیبراهیم وەڵامی دایەوە: بەڵێ

هاجەر کە ئەم وەڵامەی بیست ووتی: ئەگەر خوای گەورە فەرمانی کردبێ، ئەو بێ بەشمان ناکات.

ئالەم ساتو وەختە زۆر سەختەدا ئیبراهیم(علیه السلام) ڕوو دەکاتە پەروەردگارو بێ دەسەڵاتی خۆی بە دەسەڵاتی خوای گەورە دەسپێرێو دەفەرمووێت:

﴿ربنا إني أسكنت من ذريتي بواد غير ذي زرع عند بيتك المحرم ربنا ليقيموا الصلاة فاجعل أفئدة من الناس تهوي إليهم وارزقهم من الثمرات لعلهم يشكرون﴾ (إبراهيم: ٣٧)

واتە ئەی پەروەردگارە، بەشێك لە نەوەکانم لەم زەویە چۆڵو بێ ڕوەکەی لای ماڵە پارێزراوەکەت لە هەموو دەست درێژیەك جێگیر کرد، ئەی پەروەردگارە چاوی بەزەیی

---

(١) قصص الأنبياء / ابن كثير / (ص: ١٣٨) الطبعة المخرجة.

(٢) رواه البخاري / قصص الأنبياء / ابن كثير / (ص: ١٣٨).

بەسەریاندا بێنە بۆ ئەوەی ببنە نوێژ خوێنان لەدەوری ئەم ماڵە، وەخەڵکانێکی باش و خێرخوازیان بۆلا بەرە کە جێگیر بن لایان وە پێیان ببەخشە لە ڕۆزی بۆ ئەوەی سوپاس گوزارت بن بە نوێژو پاڕانەوە[1]

بەڵێ.. خوای گەورە وەڵامی ئەو داوایەی ئیبراهیم پێغەمبەری دایەوە هەروەك باسی لێوە دەکەین: هاجر (رضي الله عنها) بە گوێی فەرمانی خوای گەورەی کردوو ئارامگری نواندو لەگەڵ ئیسماعیلدا(علیه السلام) مانەوە جا پاش ئەوەی کە هەموو ئەو ئاوەی کە پێیان بوو تەواو بوو بەڕادەیەك ئیسماعیل توشی تینوێتیەکی زۆر بوو کە بێتاقەتی کرد، هاجەریش بە بینینی ئەم دیمەنە پڕ لە بەزەییە، ئارامی لەبەر بڕاو لەتاودا خەریك بوو بێ هۆش بێت.

پاشان بەڕاکردن چووە سەر بەرزایی (الصفا) کە سەیر بکات و بگەڕێ بەدوای ئاودا بەڵام نەبوو، جارێکی تر زۆر بە شپرزەیی دەستی کردەوە بە گەڕان تا چووە سەر بەرزاییەکی تر کە ناسراوە بە(المروة) بۆ گەڕان بەدوای ئاودا بەڵام هەر نەبوو.

ئەم ڕاکردنەی بۆسەر(صفاو مروة) حەوت جار دووبارە کردەوە، کە پێغەمبەر دەفەرموێ (صەفاو مەروای خەڵکی حەج لەم بەسەرهاتەوە هاتووەو خوای گەورە لە ڕێزی هاجرو خەمخۆری بۆ منداڵەکەی کردۆێتیە بەشێکی حەج. [2]

پاش ئەم هەموو هاتوو چۆو شپرزەییەی هاجەر، لە کۆتاییدا لەسەر بەرزایی (مروة) فریشتەیەك ئاوی (زەمزەم) ی پێ پیشان دەدات، و بەفەرمانی خوای گەورە هەڵدەقوڵێ، و هاجرو ئیسماعیل(علیە السلام) لێی دەخۆنەوەو فێنکی ڕەحمەتی خوایی بە دڵو دەروونیاندا دێت، پاشان فریشتەکەبەهاجەر دەڵێ: مەترسەو خەم مەخۆ، لەم جێگەیەدا ماڵێك هەیە بۆ خوای گەورە، کە ئەم منداڵەو باوکی بینادی دنێن پەروەردگاریش خاوەنەکەی لە ڕەحمەت بێ بەش ناکات. [3]

دوای ماوەیەك لە دەرکەوتنی ئاوی زەمزەم، خوای گەورە پاڕانەوەکەی ئیبراهیمی گیرا کردو ئەم اوەی پێ بەخشین و خەڵکیشی لا جێگیر کردن، کە ئەمەی خوارەوە بەسەرهاتەکەیەتی.

---

(١) تفسير المقتطف / د . مصطفى خرم دل / (ص: ٤٥٠).

(٢) مع الأنبياء / عفيف طبارة / (ص: ١٣٢– ١٣٣).

(٣) قصص الأنبياء /ابن كثير / (ص: ١٣٧) / الطبعة المخرجة.

- لەو بیابانە وشکانەدا جۆرە باڵندەیەك هەیە بەسەر هەر شوێنێکدا بسوڕێتەوە، ئەوە نیشانەیە لەسەر ئەوەی کە لەو شوێنەدا (ئاو یان لاك) هەیە.

- کۆمەڵێك لە خەڵکی گەڕۆکیش کە لە مەملەکەتی(سبأ) ەوە هاتبوون پاش ڕوخاندنی سەدەی ئاوەکەیان کە کۆن بوو بوو بەڵام نەیانتوانی چاکی بکەن لە یەمەن، ئەوە بوو ئەو سەدە ڕووخاو وڵاتیان نوقمی ئاو بوو، ئەو ناوەیان بەجێ هێشتو ڕوویان کردە وڵاتە عەرەبیەکانی دەوریان. [1]

کۆمەڵێك لە خەڵکی ئەم مەملەکەتە کە قبیلەی (جرهم) بوون لە قحطانیەکان، ڕوویان کردە مەککە، کاتێك لە بیابانەکەی چواردەوری مەککە لایان دا لە ڕووی خوارویەوە، ئەم باڵندەیان بەدی کرد لەسەر ئەو شوێنەی ئیسماعیلو هاجر کە بەڵگە بوو لەسەر ئەوەی کە لەو شوێنەدا ئاوەدانیەك هەیە. واتە ئاو یان لاك، لەبەر ئەوە نێردراویان نارد کە هەواڵیان بۆ بێنێ، لە گەڕانەوەدا هەواڵی بوونی ئاوی بۆ هێنان. [2]

پاشان هەستانو چونە لای هاجرو ئیسماعیلو داوای ئەوەیان لێ کرد، کە ڕێگەیان پێ بدات نیشتەجێ بن لەو شوێنەدا، هاجریش ڕازی بوونی خۆی نیشان دا، ئیسماعیل کاتێ گەورە بوو ژنی لێ هێنانو هەر لەمانیشەوە زمانی عەرەبی فێر بوو، چونکە لەوەوەوپێش زمانی عەرەبیان نەدەزانی بەڵکو (عبرانی یان سریالی) قسە یان دەکرد(واتە ئیسماعیلو هاجر)[3]

هەر لەبەر ئەم هۆیەیە کە بە پێغەمبەر محمد(علیه الصلاة والسلام) دەڵێن لە ئەوەی عەرەبی(مستعربه) ن واتە لە بنەڕەتدا عەرەب نەبوون بەڵکو بوون بە عەرەب، چونکە لەنەوەی ئیسماعیل(علیه السلام) پێغەمبەرە. [4]

بەڵێ.. هەموو کات بەم شێوەیە ڕەحمەتی خوایی دەڕژێت بەسەر ئەو بەندانەدا، کە چاوەڕێی سۆزی ئەون، ئەگەر بێتو لەبەبیابانێکی چۆڵو وشکیشدا بێ، ئیتر با هەموو مرۆڤایەتی بێ ئاگابن لە نەهامەتیەکان، تەنها خوای گەورە ئاگادار بێ ئیتر با هەموو یارمەتیەکان ببڕێت، تەنها یارمەتی خوای بەسە تەنها داوای لێ بکرێ کام شت لە ژێری مرۆڤدا ئاستەنگەو نایەتە دی قودرەتی خوایی دەیهێنێتە دیو دێت بە یارمەتی بەندە ڕاستگۆکانیەوە، هەروەك چۆن هات بەدەم هاجەرو ئیسماعیلی بێ دەسەلاتەوە.

---

(١) تأريخ الاسلام / حسن ابراهيم حسن / ج ١ (ص: ٨-٩).

(٢) قصص الأنبياء / ابن كثير / (ص: ١٣٩) / الطبعة المخرجة .

(٣) تأريخ الأسلام / حسن ابراهيم / حسن / ج١ (ص: ١١).

(٤) رحيق المختوم / صفى الرحمان المبارك فورى / (ص:١٢)/ ١٩٩٧

## مل کەچ کردنی ئیسماعیل( علیه السلام ) لە ئاستی فەرمانی خواییدا

بەشێکی تر لە بەسەر هاتەکانی ژیانی ئیبراهیم(علیه السلام)، پەیوەستە بە ئیسماعیل پێغەمبەری کوڕیەوە تووشی تاقیکردنەوەیەکی گەورەی دەکات،ئەویش بەوەی کاتێك ئیسماعیل گەورەدەبێتو هەرزەکارە، خوای گەورە کوڕو باوك دەخاتە تاقیکردنەوەیەکی گەورەوە، کە لە خەوی ئیبراهیم دا فەرمانی پێ دەکرێ لە لایەن پەروەردگارەوە، کە ئیسماعیل سەربڕێ!!

هەروەك قورئان باسی لێوە دەکاتو دەفەرموێت ﴿فلما بلغ معه السعي قال يا بني اني ارىٰ في المنام اني اذبحك...﴾ (الصافات: ١٠٢).

واتە: ئەی کوڕی شیرینم لە خەومدا فەرمانم پێ کراوە لەلایەن پەروەردگارەوە کە سەرت بڕم!!(١)

بەڕاستی تاقی کردنەوەیەکی گەورەیە، ئیمانی دەوێت هەڵیگرێ قەلایەکی پتەوو لە باوەڕی دەوێت، گەورەییەکەی لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە داوای (ڕۆح) دەکات، خۆشەویست ترین شتە لەژیانی مرۆڤدا.

بەڵێ ئیبراهیم ئەم هەواڵە دەدات بە کوڕی شیرینی کە تاکە ڕۆڵەیەتی لە دوای ئەو هەموو پیرییە!!، پاشان لێی دەپرسێ کە تۆ دەڵێی چی کوڕی شیرینم؟ ﴿فانظر ماذا ترىٰ﴾ (الصافات: ١٠٢).

ئەمەیە جوانترینو بەرزترین پلەی پەیوەندی نێوانی باوكو کوڕ، زۆر بەسۆزەوە، بەدڵ گوشراوییەوە، بەسەر دانەواندنەوە دەڵێ: تۆ دەڵێی چی کوڕم، ئەمە فەرمانی خودایەو داوای گەردنی تۆم لێ دەکات؟

ئەی ئەبێت وەلامی ئیسماعیل(علیه السلام) چی بێ کە هەموو کارەکان لەسەر گەردنی ئەو وەستاوەو چاوەڕێی وەلامیەتی؟

کوڕی خواناسو ڕوو لە خوا بەگەورەترینو دلێرترین دەنگەوە، بەوپەڕی مل کەچی لە ئاستی ئەو پەروەردگارەدا کە یەکەم جار ئەمی بەخشیوە بە باوکی پیری دەڵێ:

ئەی باوکی شیرینم هەر چی فەرمانت پێ کراوە لەلایەن خوای گەورەوە بە جێی بهێنە!!

---

(١) فەرموودەیەك هەیە لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: خەوی پێغەمبەران نیگایە(وحی) یە. (رؤيا الأنبياء وحي) (رواه البخاري).

﴿قال يا ابتِ أفعل ما تؤمر ستجدني إن شاء الله من الصابرين﴾ (الصافات: ١٠٢).

واتە: ئەی باوکی شیرینم چیت فەرمان پێ کراوە جێبەجێی بکە انشاءالله لە ئارامگران دەمبینیتەوە لە سەر ئازاری ئەو سەر برینە !!!

بەڵێ... پاش ئەوەی کە کوڕو باوکی خواناس خۆیان تەسلیمی فەرمانی خوای گەورە کردو بەپەڕی دامەزراوییەوە هاتنە ژێر باری ئەم فەرمانەی خوای گەورە، دەست کرا بە بەجێ هێنانی فەرمانەکەی خوا، کە دەچینە خزمەت قورئانی پیرۆز بزانین چۆن وێنەی ئەو ڕووداوەمان بۆ دەکێشێ، دەفەرمووێت: ﴿فلما اسلما وتله للجبين﴾ (الصافات: ١٠٣).

واتە: پاش ئەوەی کە کوڕو باوك تەسلیمی فەرمانی خوایان بوون، ئیبراهیم ئیسماعیلی دابەزەوی‌دا لەسەر لایەکی، کە ئامادەی کرد بۆ سەر برین، ودەمووچاوی لەزەوی‌دا.

چەندە گرانە خوێنەری ئازیز.. ئەمە ئەوپەڕی بەرزی پیشانی مرۆڤایەتی دەدات لە گوێڕایەڵی‌کردن و خۆبەخت کردندا لەلایەن باوك و کوڕێکی ئیماندارەوە.

ابن کثیر لە ڕاڤەی ئەم دەقەدا دەفەرمووێت: (صرعه على وجهه ليذبحه من قفاه لايشاهد وجه عند ذبحه ليكون اهون عليه)[1]

واتە: لەسەر دەم و چاو دایبەزەوی‌دا، بۆئەوەی لەپشتەملی‌یەوە سەری ببڕێ و دەموچاوی نەبینێ و هەست و سۆزی بووروژێنێ.

ئای.. چەندە ناسۆرەو چەندە تاڵە، باوکێك جەرگی خۆی بەدەستەکانی خۆی لەزەویدا خستووەو کۆتایی بە ژیانی دەهێنێ، لەهەمان کاتیشدا فەرمانی خوایەو دەبێت بەجێ بهێنرێ.

لەناو ئەم هەموو ڕووداوە ویژدان هەژێنانەدا، ئیسماعیل سەیرێکی باوکی پڕ لە سۆزی دەکات کە تەنها چەند ساتێك ماوە لە ژیاندا چاوی بە چاوی دەکەوێت و دەڵێ: ئەی باوکی شیرینم پاش ئەوەی کە ڕۆحم دەردەچێت هیچ پارچە قوماشێك نیە کە تێیدا کفنم بکەی تەنها ئەم کراسە سپی‌یەم هەیە بیدڕێنە لەبەرمداو، لەدوای مردنم تێم بئاڵێنە [2] بەڵام ئاخۆ خوای گەورە بەو هەموو سۆزو بەڕەحمی‌یە ئاگاداری مەرگی بەندەکانی نەبێ، ئایا ئیبراهیم بە جێ دەهێڵێ کە ئسماعیل سەر ببڕێ؟

نەخێر.. هەرگیز لەگەڵ بەزەیی خوای گەورەدا ناگونجێ بۆیە کاتێك کە هەوڵی دا کەندنی کراسەکەی دەدات و دەیدڕێنێ لەبەر ی ئیسماعیلدا لەلایەن خوای گەورەوە بانگی لێ

(١) تفسير القرآن العظيم / ابن كثير / ج٤ /(ص: ١٤) / الطبعة المحققة .

(٢) ئیبن عەباس ووتوویەتی/ تفسير القرآن العظيم / ابن كثير / (ص: ١٤) ـج ٤ ـ

دەکرێ، کە ئیبراهیم ئەوەی خوای گەورە ویستی لێت لەخەوەکەتدا بەجێت هێناو بەڕاستی هەستان بە بەجێ هێنانی فەرمانی خوا، کە هەستایت بە سەر بڕینی کوڕەکەت.[1]

پاشان خوای گەورە وەسفی ئەم تاقیکردنەوە گەورەیە دەکات کە بەسەر ئیبراهیم‌و ئیسماعیلدا ڕوویداو دەفەرمووێت: بەڕاستی ئەم تاقیکردنەوەیە، تاقیکردنەوەیەکی گەورەیەو ڕاستی ئیمانی تێدا دەردەکەوێت.

﴿ان هذا لهو البلاء المبين﴾ (الصافات: ١٠٧).

لەپاداشتی ئەمەدا خوای گەورە بەرانێکی بۆ ناردە خوارەوە کە سەر ی ببڕێ لەجیاتی ئیسماعیل ﴿وفديناه بذبح عظيم﴾ (الصافات: ١٠٧).

لەلای جمهوری زانایان وا مەشهورە کە ئەو بەرانە، بەرانێکی سپی‌و چاو زۆر ڕەش‌و شاخ گەورە بووە.

لەم بەسەر هاتەوە قوربانیکردنی جەژنی قوربان کە چوار ڕۆژە دروست بوو، وە بووە سوونەتی ئومەتی محمد(ﷺ)، کە ئەگەر هەبێت سونەتە جەژنان بەران بکرێ بە قوربانی.

بەڵێ ئازیزان.. تاقیکردنەوەکانی خوای گەورە پێویستی بە ئارام گری زۆر هەیەو پێویستی بە ئیمانی دامەزراو هەیە، ئەم تاقیکردنەوانەش تەنها بۆ دەرخستن لایەنی ڕاستگۆی‌و ناڕاستی باوەڕە، کە داواکارین لە خوای گەورە بمان کاتە ئەو کەسانەی کە ئارامگر دەبێت لە ئاستیاندا(امین)[2]

هەر لەبەر ئەم هەموو ئارامگرییەی ئیبراهیم بوو کە خوای گەورە لە پاداشتیدا دەفەرمووێت:

﴿وتركنا عليه في الأخرين سلام على ابراهيم كذلك نجزي المحسنين انه من عبادنا المؤمنين﴾ (الصافات:١١١)

واتە: ئەوەندە شایەنی ڕێز بوو، کردمانە یەکێك کە ئەوانەی دوای خۆی کە دێن، لەسەر زمانیانەوە بە چاك باسی لێ بکەن، سەلام‌و ستایش بێت لەسەر ئیبراهیم، ئا بەم جۆرە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە، بەڕاستی یەکێك بوو لە بەندە باوەڕدارەکانمان.

---

(١) قصص الأنبياء / ابن كثير / (ص: ١٤٣) / الطبعة المخرجة.

(٢) لەم چیرۆکەدا بە درێژی باس لە ئیسحاق ناکەین، بەڵکو هەموو پێغەمبەرێك ژینی سەربەخۆمان بۆ داناوە، هەروەك چۆن باسمان لە لوط نەکردو لە ئیسحایش بە درێژی ناکەین تەنها ئەو پێغەمبەرانەبێت کە زۆرکەم باسیان هاتووە، دەیانبەستین بە پێغەمبەرێکی ترەوە).

## مژدەی بەخشینی ئیسحاق( علیه السلام )

پاش ئەم هەموو تاقیکردنەوانە، خوای گەورە پاداشتێکی گەورەترو خێرا تری دایەوە بە ئیبراهیم کە ئەویش بەخشینی ئیسماعیل بوو پێی، لە(سارە) ی خێزانی دووەمی کە نەزۆك بووو منداڵی نەدەبوو، ئەمیش ئەوپەڕی گەورەیی خوای گەورە دەدەخات و فراوانی دەسەلاتی دەسەلمێنێ.

قورئانی پیرۆز لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

﴿وبشرناه بأسحاق نبيا من الصالحين﴾ (الصافات: ١١٢).

واتە: وە مژدەمان پێدا بە ئیسحاق کە پێغەمبەرێکی صالح دەبێت.

ئەم مژدەیە لەسەر دەمی چەند فریشتەیەکەوە درا بە ئیبراهیم (علیه السلام) لەکاتێکدا کە دەچوون بۆ بە هیلاك بردنی گەلەکەی (لوط) پێغەمبەر(علیه السلام) [1]

قورئان بەسەرهاتی ئەم مژدەیەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێت: ﴿ ولقد جاءت رسلنا ابراهيم بالبشرى قالوا سلاما, قال سلام, فما لبثوا ان جاءبعجل حنيذ فلما رأى ايديهم لاتصل اليه نكرهم واوجس منهم خفيه قالوا لاتخف انا ارسلنا الى قوم لوط وامرأته قائمة فضحكت فبشرناها بأسحاق ومن وراء اسحاق يعقوب قالت ياويلتى ألِدُ وَأنا عجوز وهذا بعلي شيخا ان هذا لشيء عجيب قالوا اتعجبين من امر الله رحمة الله وبركاته عليكم اهل البيت انه حميد مجيد﴾ (هود: ٦٩-٧٥ ).

واتە: کاتێك کە نێردراوەکانمان -واتە فریشتەکان - هاتنە لای ئیبراهیم و سارەی خێزانی مژدەی بەخشینی منداڵێکی تری پێ بدەن کە ئیسحاقە، سەلامیان کرد لە ئیبراهیم ئەویش وەلامی سەلامی دانەوە، زۆرێکی نەبرد ئیبراهیم (گوێرەکە) یەکی برژاوی لەبەردەمیاندا دانا بۆئەوەی بیخۆن - چونکە ئیبراهیم نەیدەزانی کە فریشتەن-[2]

کاتێك بینی دەستیان درێژ ناکەن بۆ خواردنەکە پێی سەیر بوو، لە نەفسیدا ترسی لێ نیشت لێرەدا فریشتەکان پێی دەڵێن کە مەترسە ئێمە نێردراوین بۆ لە ناوبردنی گەلی (لوط) (علیه السلام) وەسارەی خێزانی وەستابوو گوێی لەم گفتوگۆیانە بوو پێکەنی لەخۆشی لەناو چوونی گەلی لوط چونکە زۆر تاوانکارو بێ باوەڕ بوون [3]

---

(١) چیرۆکی لەناوبردنی قەومەکەی لوط ، بەدرێژی لە چیرۆکی لوط دا باس دەکەین( انشاء الله).

(٢) یەکێك لە دیار ترین ڕەوشتە بەرزەکانی ئیبراهیم ئەوە بووە کە هەردەم حەزی بە میوان و خزمەت کردن کردووە.

(٣) تفسير القرآن العظيم / ابن كثير / ج٢ / (ص: ٤١١).

پاش ئەمانە لەلایەن فریشتەکانەوە مژدەی ئەوەمان پێدا، کە منداڵێکی دەبێت بە ناوی(ئیسحاق) (علیه السلام) وە لە ئیسحاق (یەعقوب) (علیه السلام).

سارە لە وەڵامی ئەم مژدەیەدا بەسەر سوڕماوییەوە ووتی:

چەندە سەیرە ! ! ئایا من منداڵم دەبێت لەسەر ئەم هەموو پیرییەوە، وەمێردەکەشم پیاوێکی پیرو تەمەن گەورەیە؟

فریشتەکان لەوەڵامدا پێیان فەرموو: ئایا سەرت سوڕ ئەمێنێ لە کاری خوای گەورەو بەدەسەڵات؟ بەزەیی و رەحمەتو بەرەکاتی خوای گەورە لە سەر ئێوەیە کە نەوەی پێغەمبەرانتان پێ دەبەخشێ ئەی خاوەنی ماڵی پێغەمبەرایەتی و کەعبەی پیرۆز.

بەڕاستی پەروەردگار شتانێك دەکات کە شایەنی سوپاس گوزاری و حەمدە گەورەو بەدەسەڵاتە بۆبەخشینی نیعمەت. نیعمەتی خوای گەورە کاتێك دێت بۆ مرۆڤەکان و فەرمانی خوای لەگەڵدایە کە ئەو نیعمەتە بکات، هەموو قیاسە ماددیەکان دەوەستێت ئەوەی روو دەدات ژیری مرۆڤ ناتوانێ هەڵی گرێ چونکە ئامرازەکان لەوە گەورە ترو بەهێزترو بەڕێز ترن کە لە خەیاڵی مرۆڤدا بەرجەستە بکرێ.

ئیبراهیم لەسەرەتادا تەنها منداڵێکی نەدەبوو، هەموو مرۆڤایەتیش نەیدەتوانی بۆی بێنێتە بوون، بەڵام ... کاتێك (قدیر) فەرمان دەکات تەنها پێویستی بە (ك.ن) یەك هەیە ! ! و لە جیاتی منداڵێك دووانی پێ دەبەخشێ.

هەروەها خوای گەورە لە شوێنێکی تر لە قورئاندا دەفەرمووێ:

﴿ونبئهم عن ضيف ابراهيم اذ دخلوا عليه فقالو سلاما قال انا منكم وجلون قالوا لا توجل انا نبشرك بغلام عليم قال ابشرتموني علي ان مسني الكبر فبم تبشرون قالوا بشرناك بالحق فلا تكن من القانطين , قال ومن يقنط من رحمة ربه الا الضالون﴾ (الحجر:٥١ – ٥٦).

واتە: باسیان بۆ بکە ئەی محمد(ﷺ)، لەبارەی میوانەکانی ئیبراهیمەوە – واتە فریشتەکان – کاتێك چوونە لای ووتیان سەلام و ئاشتی خوا لەسەرت بێ، پاش ئەوەی کە خواردنەکەیان نەخوارد، ئیبراهیم ووتی: ئێمە دەترسین لێتان کە لەوانەیە لە میوان نەچن؟

فریشتەکان بۆ دڵ نەوایی ئیبراهیم ووتیان: مەترسە هیچ زیانمان بۆتان نییە بەڵکو لەلایەن پەروەردگارەوە هاتووین کە مژدەی منداڵێکت پێ بدەین کە دواڕۆژ زاناو زانیار دەردەچێت – واتە ئیسحاق –

ئیبراهیم ووتی: چۆن مژدەی منداڵم پێ دەدەن لەدایك ببێ، کە وا گەیشتو مەتە تەمەنی پیریی‌و لەوەدا نەماوم کە منداڵم ببێ، ئەی چۆن ئێوە مژدە دەدەن؟

فریشتەکان ووتیان: ئەمەی ئێمە مژدەت پێ دەدەین ڕاستەو گومانی تێدا نییە، چونکە فەرمانی پەروەردگارە، مەبە بەو کەسانەی کە نائومێدن لە ڕەحمی خوا، ئەوە ڕەحمی خواییە.

ئیبراهیم ووتی: من هەرگیز لەم کەسانە نیم کە نائومێد دەبن لە بەزەیی خوایی، چونکە ئەوانە بێ ئومێد دەبن لە ڕەحمی خوا، کە بێ ئاگان‌و بێ خەبەرن لەگەورەیی‌و دەسەڵات‌و ڕەحمی خوا.

بەڵێ.. سنووری دەسەڵاتی خوایی ئەوەندە بڵاوە هەرگیز هەستیارە ماددیی‌یەکانی مرۆڤ ناتوانێ هەستیان پێ بکات، ئەوە ئیبراهیمەو سەرسام دەبێت؟!!

دەسەڵات‌و ڕەحمەتەکە ئەوەندە گەورەیە پێغەبەرانیش سەرسام دەکات؟! ئەمەیە ئەو خوایەی کە شایەنی پەرستنە، نەك ئەوانەی‌کە ناتوانن زیان‌و باشە بە خۆیان بگەیەنن، کرنوش بردن بۆ زاتێکی ئاوا دەسەڵاتدار دەبێ بکرێ نەك بۆ ئەوانەی کە خۆیان کردۆتە خوای سەر زەوی، داوا کردن تەنها شایەنە لەم زاتە بکرێ، نەك لە دروستکراوەکانی، ترسان تەنها لەم بێت نەك لە هەموو شتەکانی تر.

چەندە گەورەیە.. هەموو مرۆڤایەتی.. هەموو ژیریەکان هەموو ئامرازەکان... هەرچی هەیە لە بوونەوەردا توانایان یەکسانە بە هیچ لەبەرامبەر تواناو دەسەڵاتی (الله) دا.

دوای ئەوەی کە ئەم مژدە گەورەیە دەدەن بە ئیبراهیم‌و سارە هۆی هاتنی خۆشیان - واتە فریشتەکان- بۆ ئیبراهیم ڕوون دەکەنەوە، ئەویش ئەوەیە کە هاتوون بۆ لەناوبردنی گەلەکەی پێغەمبەر (لوط).

﴿قال فما خطبكم ايها المرسلون * قالوا انا ارسلنا الى قوم مجرمين﴾ (الحجر: ٥٧-٥٨). (١)

شوێنی ئەم مژدە دانە لەلایەن فریشتەکانەوە وولاتی شام بوو، چونکە سارە لەم شوێنەدا جێگیر بوو، بەڵام هاجەر لە مەککە هەروەك پێشتر باس کرا.

---

(١) هەروەك لە پێشدا باسمان لێوە کرد، ئیبراهیم مامی لوط بوو (عليه السلام) وە هەردووکیان لە یەك سەردەمدا بوون، وەئەم بەسەرهاتە بە درێژیی لە چیرۆکی لوط دا باسی لێوە دەکەین (انشاء الله) .

## دروست کردنی یەکەم ماڵ بۆ خوای گەورە لەسەر زەویدا (کەعبە)

ئازیزان .. گەورەترین و دیار ترین ڕووداوێك لەچیرۆکی ئەم پێغەمبەرە خۆشەویستە دا خۆی لەم باسەدا دەبینێتەوە، گەورەی خودی ئیبراهیمیشی تێدا دەردەکەوێت، کە چەندە ڕێزو قورسایی هەبووە لەلای خوای گەورە.

ئەویش بەوەی کە هەڵدەستێت بە دروست کردنی یەکەم ماڵ بۆ خوای گەورە لەسەر زەویدا، بۆ ئەوەی بەندەکان خوای خۆیانی تێدا بپەرستن.

کە ئەویش (کەعبە) یە لە شاری مەککەی پیرۆز، ئەو کەعبەیەی کە ساڵانە چەندەها خەڵك لە چواردەوری هەموو جیهانەوە ڕووی تێ دەکەن، بەمەبەستی پەرستش، کە ڕوکنێکی [1] تەواوە لە ئیسلامدا.

دروست کردنی ماڵێك بۆ ئەوەی خوای گەورەی تێدا بپەرسترێ لەسەر زەوی لەلایەن ئیبراهیمەوە، فەمانێکی خوایی بوو، واتە خوای گەورە ئەم کارە گەورەی خستە ئەستۆی ئەم پێغەمبەرە دڵسۆزە، کە ئسماعیل پێغەمبەری کوڕیشی لەگەڵیدا بوو.[2]

قورئان باس لە دروست کردنی ئەم ماڵە دەکات، کەدەفەرموێت:

﴿واذ بوأنا لأبراهيم مكان البيت ان لاتشرك بي شيئاء وطهر بيتى للطائفين والقائمين والركع السجود , واذن في الناس بالحج يأتوك رجالا وعلى كل ضامر يأتين من كل فج عميق﴾ (الحج: ٢٦-٢٧).

واتە: کاتێك ڕێنموی ئیبراهیم مان کردو شوێنی (کەعبە) مان پیشان داو فەرمانمان پێ کرد کە: هاوەڵ بۆ پەروەردگار قەرار نەدا لەپەرستندا -واتە جگە لە خوای گەورە فەرمانی تر جێ بەجێ نەکەیت و هەڵنەبژێری بە خوا -و ئەم ماڵە - کەعبە - پاك بکەرەوە لە هەموو پیسییەکی بتە دەستکردەکان و لە هەموو پیساییەکی تر، بۆئەوەی ئامادە بێت و ببێتە شوێنێك بۆ بەندەسووڕ خواردوەکان بە چواردەوری کەعبەداو، ئەوانەی کە هەڵدەستن بە گەورە کردنی خوا بە هەموو جۆرێك لە پەرستش، ئەوانەی نوێژ دەکەن و دەچنە رکوع و دەچنە کڕنوش بۆ پەروەردگاریان. ئەمەیە ڕەحم و بەزەیی خوایی بۆ بەندەکان، بەو هەموو گەورەیی و دەسەڵاتەی کە هەیەتی، خاوەنی هەموو بوونەوەر، ئەو زاتەی فریشتە لەژمارە

---

(١) ڕوکن: واتە بەشێکی فەرمان پێکراوە، کە مرۆڤی موسوڵمان دەبێت حەج بکات و سەردانی ئەم کەعبەیە بکات ئەگەر هات و توانی.

(٢) سورة (البقرة: ١٢٥).

نەهاتووەکان هەردەم لە پەرستنی دان خەمخۆری بەندەکانی‌یەتی‌و ئاماژە دەکات بەوەی کە بەتایبەتی‌و زاتی خۆی کە جێگەیەك هەڵبژێری بۆ بەندە، ئەبێ ئەو شوێنەی پەروەردگارێکی ئاوا زاناو دانا هەڵیبژێرێ چەندە پیرۆز بێ؟

فەرمان دەدات بە پێغەمبەرەکەی کە ئەم شوێنەیان بۆ بیاد بنێ‌و بۆیان بکاتە ماڵێك‌و شوێنگایەك. کە بەڕاستی ئەمەش ئەوپەڕی ئاگاداری خوای زانا دەگەیەنێ بە بە ندەکانی، و بەڵگەیە لەسەر ڕێزی مرۆڤ لەلای پەروەردگار.

لە جێگایەکی تر قورئاندا خوای گەورە ناوی ئیسماعیلیش دەخاتە ناو ئەم فەرمانەوە، و ئەو ڕێزە لە ئیسماعیلیش دەنێ ﴿وعهدنا الى ابراهيم واسماعيل ان طهر بيتي للطائفين والركع السجود﴾ (البقرة: ١٢٥).

بەڵێ... فەرمان کراوە لەلای پەروەردگارەوە ئێستا پێویستی بە جێ بەجێ کردنە لەلایەن هەردوو پێغەمبەرەوە -ابراهيم، اسماعيل - (عليهما السلام).

قورئان لەبارەی چۆنیەتی درووست کردنەکەیەوە دەفەرمووێت ﴿واذ يرفع ابراهيم القواعد واسماعيل ربنا تقبل منا انك انت السميع العليم ربنا واجعلنا مسلمين لك و من ذريتنا أمة مسلمة لك وأرنا منا سكنا وتب علينا انك أنت التواب الرحيم, ربنا وابعث فيهم رسولاً منهم يتلو عليهم اياتك ويعلمهم الكتاب والحكمة ويزكيهم انك انت العزيز الحكيم﴾ (البقرة: ١٤٧-١٤٩).

واتە: کاتێك کە وئیبراهیم‌و ئیسماعیل بناغەی ماڵەکەیان بەرز دەکردەوە - کەعبە - دەپاڕانەوەو دەیان ووت: ئەی پەروەردگارمان ئەم کارەمان لێ وەر بگرەو پاداشتمان بدەرەوە لەسەری‌و بیکە بەکارێك کە تەنها لەبەر ڕەزامەندی تۆ کرابێت. ئەی پەروەردگارە تۆ ئاگاداری‌و بیسەری لە داوەکەمان‌و لە نیتەکانمان.

ئەی پەروەردگارە بمانکەرە دوو بەندەی یەکتاپەرست‌و دڵسۆز بۆ خۆت‌و لەنەوەکانیشماندا کۆمەڵێکی دڵسۆزو یەکتاپەرست دروست بکەو هیدایەتیان بدەو ڕێنموی پەرستنەکانمان بکەو لێمان خۆش بە لەتاوانەکانمان، چونکە بەڕاستی هەر تۆ لێبووردەو بەبەزەیی‌ت بەرلمبەر تاوانەکانی بەندەکان‌و ئەی پەروەردگارە لەنەوکانماندا پێغەمبەرێکیان بۆ بنێرە کە ئایاتی تۆیان بەسەردا بخوێنێ‌و فێری پەیڕەوی خوایان بکات - واتە قورئان - وە فێری کارو ڕەوشتی بەرزو جوان‌و دانایی‌و زانایی‌یان بکات - واتە سنة -و پەروەردەیان بکات لەسەر گوێڕایەڵی پەروەردگارو پاکیان بکاتەوە لە

تاوان بەڕاستی تۆ بە تواناو دەسەڵاتی بۆ وەڵام دانەوەی ئەم داوایانەی ئێمەو زاناو داناشی بەکام شت باشە بۆ بەندەکان. (١)

ئەم ماڵە پیرۆزەی خوای گەورە لەسەر زەوی ئەوەندە بەڕێزو پیرۆزە لای پەروەردگار، کە هەرکەس چووەناوی ئەوا لە ئاسایش دایەو زیانی پێ ناگات لە هیچ لایەکەوە، وەجارێکی تریش خوای گەورە بەیەکەم ماڵ ناوی دەبات لەسەر زەویدا کە بۆ خوای گەورە بنیاد نرابێت.

﴿ان اول بيت وضع للناس للذى ببكة مباركة وهدى للعالمين فيه ايات بينات مقام ابراهيم ومن دخله كان امنا﴾. (٢)

بەدروست کردنی ئەم ماڵە لەسەر زەوی بۆ ئەوەی بەندەکانی خوای گەورە پەرستشی تێدا بکەن ناوی لێنرا(حەج) بەمانای کۆبوونەوە لە دەوری کەعبەو (طواف) کردن بەدەوریدا. (٣)

ئەم کۆبوونەوەیە لەلای ئاینەکان بە کارێکی پیرۆز سەیر دەکرێتو ساڵانە لە هەموو لایەکی جیهانەوە خەڵکی دێنە خزمەتی ئەم ماڵی خوایە کەئەم ڕووکردنە کەعبەیە هەرلەزۆر کۆنەوە هەیەو عەرەبیش پێش ئیسلام کردوویانە، نەك هەر تەنها لە سەردەمی پێغەمبەردا(٤)

هاتنی ئەم خەڵکە بۆ چواردەوری کەعبە، بەبانگ کردنی ئیبراهیم بوو، بەفەرمانی خوا، واتە خوای گەورە فەرمانی کرد بە ئیبراهیم کە خەڵکی ئاگاداربکەرەوە کە ئەم ماڵی خوایە دروست کراوە بۆ ئەوەی بەندەکانی خوا تێیدا پەرستش ئەنجام بدە کەناوی (الحج)ە، فەرمانێکە لەسەر ئەوانەی دەتوانن ﴿واذن في الناس بالحج يأتوك رجالا وعلى كل ضامر يأتين من كل فج عميق﴾ (الحج: ٢٧).

بەڵێ: بەئاشکرا گەورەییو بەسۆزی خوای گەورە لەم بەسەرهاتە دا دەردەکەوێت، بۆ ئەوەی فەقیرەکانی سەر زەوی هەموویان بەیەکەوە هەست بە کەمی نەکەن، پادشاکانو دەوڵەمەندەکان هەست بە بەرزی نەکەن، بۆ ئەوی چاك بزانن کە لە کێشانی خواییدا کام بەندە ڕەوشت بەرزو کام بە تەقوا ترە، ئەوا بەڕێز دەبێت پادشا لە دوای بارهەڵگرەوە ڕابکاتو بۆشی نیی نارەزایی دەربڕێ، چونکە هەموو لەبەردەم کێشانەی (رب العالمين) دا وەستاون.

---

(١) بۆ زیاتر شارەزا یی سەیری – روح الدين الأسلامية / عفيف طبارة بكه (ص:٢٥٨–٢٦٥).

(٣) تفسير ابن كثير : ج ١ / (ص: ١٦١) . الطبع المنتقمة .

(٢) لە ڕۆژی دواییشدا (دجال) تەنها ناتوانێ بچێتە مەککەو مەدینەوە لە سەر زەویدا .(حديث الجساسه) (رواه مسلم).

(٤) روح الدين الأسلامى : عفيف طبارة : (ص: ٢٥٨).

خوای گەورە ئەوەندە کارەکەی ئیبراهیمی بەلاوە گەورە بوو، قورسایی ئیبراهیمی لابەرجەستە بوو، کە ئەم ماڵەی کردە ئەو شوێنەی کە لە هەموو جیهانەوە، هەموو بەندەکانی سەر زەوی کاتێك ڕوو دەکەنە پەروەردگاریان و گەورەترین کارێك کە(نوێژ)ە بۆ ئەوەی بە جێ بهێنن دە بێت ڕوو بکەنە(کەعبە)، کە ئەوەش بەفەرمانی پەروەردگار بوو

لە پێشدا موسوڵمانان ڕوویان دەکردە(بیت المقدس) بۆ نوێژ، پاشان خوای گەورە فەرمانی کرد کە ڕوو وەربگێڕن بۆلای کەعبە.[1]

﴿واتخذوا من مقام ابراهيم مصلى﴾ (١٢٥).

بەڵێ.. کەعبە بووە جێگای پەرستشێکی سەرپەست کە هەرکەس توانای هاتنی هەبوو بۆ ئەم پەرستشەپێویستە درێغی نەکات.

﴿ولله على الناس حج البيت من استطاع اليه سبيلا...﴾.

هەندێك لە دەنگو باس دەڵێن کە،کەعبە پێش ئیبراهیم (عليه السلام) دروست کراوە، بەڵام هیچ بەڵگەیەکی ڕاستی (صحیح) لەسەر نەهاتووە.

خوای گەورەش وەڵامی بەرزترین و جوانترین نزای دایەوە، بەچاکترین کەسێك کە پێغەمبەر محمد (عليه الصلاة والسلام) داوایان کرد کە خوای گەورە بینێرێ بۆ نەوەکانیان.

پیرۆزی ئەم ماڵی خوایە لەبەسەرهاتێکی تری گەورەدا دەردەکەوێت، ئەویش بەسەرهاتی (فیل) ە کە خوای گەورە لە قورئاندا تۆماری کردووە بۆمان، کە ئەمە بەسەرهاتەکەیەتی بە کورتی:

لەسەردەمی (عبد المطلب) دا باپیری پێغەمبەر (ﷺ) پادشایەك لەیەمەن بەناوی (ئەبرەهە)کە گاور (مسیح) بوو، کەنیسەیەکی دروست کرد بۆئەوەی خەڵکی وەك کەعبە بێن بۆ حەج بەدەوریداو ببێتە وێنەی کەعبە،عەرەبیش ئەم کارە زۆر ناڕەحەتی کردن و پێیان ناخۆش بوو، هەروەك لە (تفسیری ابن کثیر)داهاتووە، کۆمەڵێك لە گەنجانی قوڕەیش دەچن ئەم کەنیسەیە دەڕوخێنن و دەیسووتێنن، کاتێك ئەم هەواڵە دەگاتە (ئەبرەهە)ی پادشای یەمەن، سوێند دەخوات کە بچێتە سەر کەعبەو بیڕوخێنێ.

بەلەشکرێکی زۆرەوە ڕوو دەکاتە مەککە و فیلیان لەگەڵ دا دەبێت، لەپێش هەموویشیانەوە فیلێکی گەورەو چاك ، کە (نجاشی) خۆی بۆ ئەبرەهەی ناردبوو.

بەڵام کاتێك دەگەنە دەوروبەری مەککە، فیل دێت بەچۆکاو هەنگاونانێ بەرەو ڕووی

---

(١) ئەم ڕوو وەرگێڕانە لە نوێژێکدا بوو لە مدینە، کە بەجەماعەت دەکراو پێغەمبەر ڕوی تێدا وەگێڕا.

# پەندو ئامۆژگارییەکانی بەندی پێنجەم

(١) دیار ترین خاڵێك کە پەندو ئامۆژگاری زۆری تێدا بێت بۆ ئیمانداران لەم چیرۆکەدا، بریتییە لە بەسەر هاتی کۆچی (هاجەرو ئیسماعیل) بۆ مەککە، کە ئەوپەڕی مل کەچی ئیبراهیمو هاجەری خێزانی دەردەخات بۆ فەرمانی خوای گەورە، و ئەوپەڕی حیکمەتی خوا دەردەخات لە فەرمانەکانیدا.

کۆچ کردن بە منداڵێکی شیرەخۆرەو دایکی بۆ شوێنێکی ووشکو بێ ئاوو بێ کشتوکاڵو بێ مرۆڤ، هەروا کارێکی ئاسان نییەو کەم بیرو بۆچوون هەڵیدەگرێو ئافەرینی لێ دەکات.

بەڵام دەبینین ئیبراهیم(عليه السلام) بەوپەڕی باوەڕبوونو متمانە بە حیکمەتی خوایی، هەردووکیان هەڵدەگرێو کۆچیان پێ دەکات، چونکە باوەڕەکە گەیشتۆتە پلەیەك کە هەردەم فەرمانەکانی بەلاوە ئاسان بێت،و پشت ئەستوور بێت بەخوای گەورەو باوەڕداربێت بە حیکمەتی.

ئەمڕۆی موسوڵمانانیش پێویستە ئەو ڕاستییە بزانن، کە هەرکارێك فەرمانی خوای لەسەر هاتبوو خوای گەورە پێی چاك بوو بکرێ، ئەوا لە عاقیبەتی نەترسنو هەردەم بەرفراوانی حیکمەتی خواییان لەبەرچاو بێت، هەروەك چۆن(هاجەر) یش کاتێك هاوار لە ئیبراهیم دەکات لە چۆن لەم ووشکانییە بە جێیان دەهێڵێت، کاتێك لە وەڵامدا پێی دەڵێت.. واتە ئیبراهیم، کە ئەمە فەرکانی خوایە، ئەوا زۆر بە ئارامییەوە دەڵێت، کەواتەبێخەمم!!!

ئەمەش ڕاستی ئەو دەقە قورئانییە دەسەلمێنێ کە دەفەرمووێ:﴿ومن يتوكل على الله فهو حسبه﴾ هەرکەس پشت ببەستێ بە خوای گەورە ئەوا ئەوی بەسە.

باوەڕبوونو لەبەرچاوگرتنی حیکمەتی خوایی لەکارەکاندا زۆر گرنگە بۆ ئەمڕۆی موسوڵمانان، بەو واتایەی کە هەموو فەرمانەکانی خوای گەورەمان لەلا پەسەند بێت، ئەگەر هاتو لەگەڵ بیرو بۆچوونی ئەوساتەی خۆشماندا نەگونجا، چونکە حیکمەتی خوایی زۆر لە بیرو بۆچوونی مرۆڤ بەرزترە، هەروەك چۆن هیچ ژیرییەك بەجێ هێشتنی هاجەرو ئیسماعیل قبولْ ناکات.

بەڵام زۆر جار لەوانەیە کارێك بەلای خۆمانەوە باش بێت، بەڵام خراپەی تێدایە بۆمان، یاخود کارێك بەلای خۆمانەوە خراپ بێت، بەڵام چاکەی تێدایە بۆ ئێمە:

پیرۆزترین مـالّی خـوا هەرچەندە زۆری لیّ دەکریّ، خـەڵکی مەککـەش لەسـەر هەموویانـەوە (عبـد الطلـب) هیـچ دەسـەلاّتێیان بەرامبـەر (ئەبرەهـە) نـابێت‌و، عبـد المطلـب ووتەیـەکی بەناوبانگ دەڵیّ بە ئەبرەهە لەبارەی پاراستنی کەعبەوە لەم هێرشە.

ئـەویش ئەوەیە کـە دەڵـیّ ئـەم مالّـە خاوەنـی هەیـە - واتـە خـوا - هـەر ئـەویش دەیپارێزیّ. (وان للبيت ربا سيحميه).

بەڵیّ... خوای گەورە ماڵی خۆی بەشێوەیەك پاراست کە لە بۆچوونـی هیـچ کەسێکدا نەبوو، ئەویش بە ناردنی (طير الابابيل) بۆسەر ئەم لەشکرەو بەردباران کردنیان لەلایەن ئـەو سەریازانەی خوای گەورەوە[1]

﴿بسم الله الرحمن الرحيم الم تر كيف فعل ربك بأصحاب الفيـل, الم يجعـل كيدهـم في تضليل وارسل عليهم طيراً ابابيل ترميهم بحجارة من سجيل فجعلهم كعصف مأكول﴾(الفيل).

ئەم بەسەرهاتە پڕ لە گەورەیی‌و سەیرە، لەساڵی لەدایك بوونـی پێغەمبـەر دا(ﷺ) ڕووی دا هەروەك مێژوو باسی لێوە دەکات. (٥٧١) زایینیی..

کەعبەش جارێکی تر لەلایەن (قريش)ەوە بنیاد نراوەتەوە لە دوای ئەو لافاوەی کە ئـەو ناوەی گرتەوەو پێغەمبەری ئازیزمان(محمد) (ﷺ) بەدەستی پیرۆزی خـۆی (الحجـر الأسـود) بەردە ڕەشەکەی بۆ دانایەوە.

ئەم بەردە ڕەشەش بەردێکی پیرۆزە لە سوچی کەعبـە، کـاتێك کـە حاجیـان (الطـواف) بە چوار دەوری کەعبەدا دەکەن حەوت جار، هەموو خولانەوەیەك لەو بەردە ڕەشەوە دەست پیّ دەکەن، وە پێغەمبەری ئازیزمان ماچی کردووە

لەبەر پیرۆزی، بەوەی کە لەبەهەشتەوە هاتووەو سپی‌و بـیّ گـەرد بـووە یەکـەم جـار، بەڵام تاوانی بەندەکان ڕەشی کردوە.[2]

بەڵیّ.. خوای گەورە هەردەم پارێزەری ماڵەکانیەتی لەدەست گومڕایان، ئیتر با هـەموو هێزەکان هەوڵی ڕوخاندنی بدەن، تازە بڕیاری خوا دەرچووە کە دەبیّ پارێزراو بیّ، ئیـتر بـا کەس نەبی بیپارێزیّ، با هەموو مرۆڤەکانی سـەر زەوی بـیّ دەسـەلاّت بـن، بـا هـەموو هێزە ستەم کارەکانیش بێن، لەلای وویستی خوای گەورە لـە جێـی نـەبوون، بەچـەند سـەربازێکی خۆی ڕوویان شۆڕ دەکات‌و سـەریان نـزم دەکـات، کـە هـەرگیز ئـەوان بیریـان بـۆی نـەچووە بەڕاستی ڕاسـتت فـەرمووە ئـەی پـەروەردگارە کـە، هیـچ کەسـێك نـازانیّ‌و نایـانژمێریّ سەربازەکانت ﴿ومايعلم جنود ربك الا هو﴾ (المدثر: ٣١).

---

(١) تفسير ابن كثير /ج٤ /(ص: ٥٠٠-٥٠٤)

(٢) روح الدين الأسلامي / عفيف طبارة / (ص: ٢٦٣) / الحديث رواه الترمذي.

﴿وعسى ان تكرهوا شيئا وهو خير لكم و عسى ان تحبوا شيئا وهو شر لكم﴾

(٢) داواكردن و پاڕانەوە لە خوای گەورە لەكاتە ناسۆرەكاندا پیشەی مرۆڤی ئیمانداره، هەروەك چۆن ئیبراهیم لەكاتی بەجێ هێشتنی هاجەرو ئیسماعیلدا كردی.

چونكه دەسەلاتو گەورەیی خوا زۆر بە ئاشكرا لەم كاتانەدا دەردەكەوێت،

ئەو جیاوازییە گەورەیەی نێوان بۆچوونەكانی مرۆڤو خوای گەورە لەم بەسەرهاتەدا بە ئاشكرا دەردەكەوێت، چۆن و لە كوێوە هاجەرو ئیسماعیل هاتن، و لە كۆتاییدا خوای گەورە مەبەستی چی لەو شوێنەدا بوو، كە دامەزراندنی ماڵێك بوو لەسەر هەموو سەرزەوی بۆ بەندەكان.

(٣) ڕێزو قەدری دڵسۆزان لەلای پەروەردگار هەرگیز وون نابێ.

كاتێك ئاو لەلای هاجەرو ئیسماعیل نەما، ئەوپەڕی دڵسۆزیو خەمخۆری هاجەر خۆی نوادن، ئەویش بە ڕاكردنی حەوت جار بۆ سەر (صەفا)و(مەروە) ، ئەوەتا خوای گەورە لەكاتی حەجدا، كە دەبێت هەمان حەوت جار، وەك هاجەر بێن و بچن لەسەر ئەم دوو گردە، كە ئەمەش ئەوپەڕی ڕێزە لە هاجەر.

ئەوانەی كە بە دڵسۆزی كاردەكەن بۆ خوای گەورە، پێویستە ئەم بەسەرهاتە بكەنە میوانی هەردەمی بیرو هۆشیانو خۆشحاڵ بن بەوەی كە دڵسۆزان ڕێز لێ نراو دەبن لە دوونیاو لە قیامەتدا، و ئەو كارە بچووكانەی كە ئەوان لە بیریان كردووە بێ ئاگابوون لە پاداشتی، ئەوا لای خوای گەورە وون نییەو، پاداشتی لە ڕۆژێكدا هەردەدرێتەوە چ لە دوونیاو لە قیامەتیشدا، هەروەك چۆن هاجەر بێ ئاگابوو لەوەی كە چەندەها سەدە، ئەم ڕێزە دەبێتە ملوانكەی ملی.

(٤) خاڵێكی تر لە پەندو ئامۆژگاری لەم بەسەرهاتەدا ئەوە دەردەخات، كە باوەڕ چەند بوو ئەوا بەجێ هێنانی فەرمانی خوایی ئەوەندە دەبێت.

مل كەچ كردنی ئیسماعیل لە ئاستی ئەو فەرمانەی خوای گەورەدا، ئەوپەڕی بەرزی پلەی ئیمانی ئیسماعیل پیشان دەدات، با ئەوانەی كە لەشیان قورسە بۆ فەرمانەكانی خوای گەورە لە ئیمانیان بپرسن چونكە گەورەترین كار لەلای باوەڕ دامەزراوان ئاسانەو بەجێی دەهێنێت، وە بچوكترینْ كار لای باوەڕ لاوازان گرانەو بەجێی ناهێنن.

ئەمڕۆی موسوڵمانانیش پێویستیەكی زۆریان بەوە هەیە كە چاوێك بگێڕنەوە بە خۆیاندا، بزانن ئیمانەكەیان لە چ ئاستێكدایەو چەندە مل كەچە لە ئاستی فرەمانەكانی پەروەردگاریدا؟

ئایا ئیمانی خۆشیو کاتە خۆشەکانە، یاخود خۆڕاگرە لە ئاست کاتە ناهەموارەکانیشدا؟

تا چەند لە ژیانی ڕۆژانەدا، فەرمانە ئاسانەکانی پەروەردگاری بەجێ دەهێنێو، بە پێچەوانەوە گەیشتۆتە ئەوپلەیەی خۆی ئامادەکردبێ بۆ فەرمانە قورسەکان؟

ئەمانەو چەندەها پرسیاری تر، سەر لە چیرۆکی ئیسماعیلەوە دەردەهێننو، بانگهێشتی ئیماندارانی ئەم سەردەمە دەکەنەوە، کە پیاچوونەوەی هەردەمی ئیمانیان بکەن.

(٥) خوای گەورە هەرگیز فەرمانێك نادات بەسەر بەندەکاندا کە زیانیانی تێدا بێ. وکارێکیش ناکات کە لە بەرژەوەندی مرۆڤ نەبێت.

فەرمانی سەر بڕینی ئیسماعیل، لەزانیاری خوای گەورەدا هەبوو کە تەنها بۆ دەرخستنی ڕاستیو بەرزی ئیمانی ئیبراهیمو ئیسماعیلە،نەك گیان لەدەست دانی ئیسماعیل بێ هۆ!!

بەڵکو بۆ دەرخستنی ڕاستی ئەو ئیمانەیە لەو سەردەمەداو، بەخشینی بەرانێك بۆیانو، بەجێ هێشتنی ئەو سونەتە بۆ نەوەکانی دوای خۆیان - واتە سوننەتی جەژنی قوربانو سەربڕینی بەران تێیدا - و دڵخۆش کردنی چەندەها بێ دەستو هەژ اران لەو جەژنەدا، کە بەدی دەکرێو بەئاشکرا دیارە، کە مەبەستی خوای گەورە بەرژەوەندی بەندەکانی بووە، لەسەر یەکی ترەوە پەندو ئامۆژگارییەکی زۆری بۆ مرۆڤایەتی بەجێ هێشتووە.

کەهەموو ئەوانە ئەوە دەسەلمێنن، کارەکانی خوای گەورە بێ حیکمەت نینو پڕ خێرو بەرەکەتن، بەڵام زۆربەی مرۆڤ هەستیان پێ ناکات.

(٦) گوێ ڕایەڵی بۆ فەرمانی خوای گەورەو بەجێ هێنانی، خاوەنەکەی سەربەرزو ڕێزدار دەکات لەلای نەوەکانی دوای خۆی.

(٧) کاتێك ئیبراهیم(عليه السلام) ڕاستەوخۆ هەستا بە جێ بەجێ کردنی فەرمانەکەی خوای گەورە، ئەو پەڕی ڕاستگۆیی نواند لەئاستی پەروەردگاردا.. خوای گەورە، هەر لە دوونیادا، لە پاداشتی ئەم کارەدا لەبیرو هۆشی نەوەکانی دوای خۆیدا کردبەخاوەن ڕێزو سەربەرزی کرد، بەڵکەش بۆ ئەم ڕاستییە، ئەوەیە کە هەموو ئاینەکانی وەك (جولەکەو مسیحیەتو ئیسلام)، لەلایەن ئیبراهیم ڕێزێکی تایبەتی هەیەو بەسەروەری پێغەمبەرانی دەزانن.

هەتا هاوەڵ قەراردەرەکانی(المشرکین) سەردەمی پێغەمبەریش(عليه السلام) خۆیان بە شوێن کەوتەی ئیبراهیم دەزانیو شانازییان بەناوییەوە دەکرد.

(٨) هەوڵدانی بەردەوام بۆ نزیك بوونەوە لە خوای گەورەو گرتنەبەری ئەو ڕێگایانەی کە دەبنە هۆی نزیك بوونەوە لەو زاتە پیرۆزە.

دروست کردنی کەعبە بۆ بەندەکانی خوا بوو، چونکە تاکە شوێنێك لەسەر زەوی‌دا نەبوو، کە بە ئاشکراو بێ خەم خوای تێدا بپەرستریٚ بۆ خەڵکی ئەو سەردەمە، ئەمەش بەدەمەوە هاتنی خوا دەگەیەنیٚ بۆ هەموو ئەو داوایانەی، کەخەڵکانی ئیمانداری پێش ئیبراهیم کردوویانە،

خۆ دەکرا لەسەردەمی(نوح) دا ئەم ماڵە بکرایە، بەڵام حیکمەتی خوای گەورە وابوو کە لەوکاتەدا بێت، و ئاگاداری خوای گەورەی تێدا دەربکەویٚ لە بەندەکانی.

(١١) گەورەیی خوای گەورەو یەکسانی هەموو بەندەکانی تر لە کۆبوونەوەی ساڵانەی چواردەوری (کەعبە) دا دەردەکەوێت بۆ مرۆڤایەتی.

باشترین پەندێك بۆ هەموو مرۆڤە لووت بەرزەکان، دروست کردنی کەعبەیە لەلایەن خوای گەورەوە.

ئەویش بۆ ئەوەی ڕوون‌و ئاشکرا بیٚ لەلای بەندەکانی کەهەموو لەبەردەم دیدی خوای گەورەدا یەك ئاستن‌و بەرزی‌و نزمی نی‌یە لە نێواندا، مەگەر بە تەقوانەبیٚ.

وە گەورەیی خواش جارێکی تر خۆی پیشانی هەموو مرۆڤایەتی دەداتەوە، بەوەی کەلە چواردەوری هەموو جیهانەوە، بەندەکان دێنە خزمەتی ئەم ماڵەو داوای لیٚ خۆش بوون دەکەن.

وە ئەوپەڕی بەرزی ڕێنموویی خوای پیشان دەدات بۆ بەندەکان، ئەویش بەوەی مرۆڤ بە هەرچەندێك تاوانەوە بچێتە خزمەت ئەو ماڵی خوایە، ئەوا بەبیٚ تاوان دێتە دەرەوەو خوای گەورە لە هەموو تاوانەکانی خۆش دەبیٚ چونکە لە ماڵەکەیدایە.

مرۆڤەکانیش پێویستە لیٚ بووردەبن بەرامبەر ئەوکەسانەی کە تاوانیان بەرامبەر ئەنجام داون‌و دێنە ماڵەکانیان، هەروەك چۆن خوا لە تاوانی ئەوان خۆش دەبیٚ لە ماڵەکەیدا.

(١٢) خاڵێکی تر لەم بەسەرهاتەدا، ئەوەدەردەخات کە باشترین کاتێك بۆ پاڕانەوەی بەندەکان لەخوای گەورەو داواکردن لیٚی، بریتی‌یە لەوکاتانەی کە خەریکن بە بەجیٚ هێنانی فەرمانێکی خواوە.

پاڕانەوەکانی ئیبراهیم‌و ئیسماعیل(عليهما السلام) لە کاتی کارەکەیاندا بوو کردیان‌و جێگیر بوو لەلای پەروەردگار.

ئەمڕۆی کارکەرانیش بۆ خوای گەورە هەردەم لە بیری پاڕانەوە داوای خێردابن لە خوای گەورە لە کاتی کارکردندا، و کەسی لیٚ بیٚبەش نەکەن، وداوای سەربەرزی ئیسلام‌و موسوڵمانان بکەن.

بەڵکو خوای گەورە پاڕانەوەی یەکێك لەو کارکەرانە جێگیر بکات‌و بەر ڕەحمەتی خوایی بکەوین (انشاء الله)

چونکە کاتێك مرۆڤ گەیشتە ئەو پلەیەی لە خوای گەورە نزیك کەوتەوە، دەبێتە دەسەڵاتدارترین کەسێك لە دوونیاو خۆشبەخت ترین کەسێك لە دوارۆژدا.

لە دونیادا بەوە دەسەڵات دارە کە نزیکە لە خوا، کام کارە لە بیرو بۆچوونی مرۆڤدا گرانەو، نابێ، ئەم نزیك لە خوایە تەنها بەهۆی داواکردنیەوە لە خوای گەورە بۆی دێتە دی، ئیتر با ئەو شتە مەحاڵ بێت لەتوانای هەموو مرۆڤایەتیدا.

بەخشینی ئیسحاق بەدوای ئیسماعیل دا، بەهۆی نزیکی ئیبراهیمەوە بوو لە خوای گەورە، هەموو مرۆڤایەتی نەیدەتوانیو هەرگیزیش ناتوانێ نیوەمنداڵێکیش ببەخشێ، بەڵام نزیکی ئەو زاتە دەیبەخشێ.

ئەمڕۆی ڕابوونی ئیسلامیش زۆر پێویستە ئەو ڕاستییە بکەنە سەرەتای هەنگاوەکانیان، وهەردەم خەریکی نزیك بوونەوە بن لە خوای گەورە، بەڵکو ئەو کارانەی کە لە بیرو بۆچوونی خۆماندا مەحاڵە بێتە دی، خوای گەورە بۆ ئەمڕۆی موسوڵمانانی سەر زەوی ئاسان بکاتو بگەینە ئەو ئاستەی شایەنی ئەو یارمەتییە خواییە بین.

(٩) ڕێزگرتنو خزمەت کردنی میوان، پیشەی هەردەمی پێغەمبەران بووە.

ئەو شێوە خزمەت کردنەی ئیبراهیم(علیه السلام) بۆ فریشتەکان، ئەوپەڕی بەرزی پلەی خووڕەوشت پیشان دەدات لە ئیبراهیمدا، وهێنانی ئەو جۆرە باشە بۆ خواردن، پیشکەش کردنی باشترین شتانێك پیشان دەدات بۆ میوان، کە خودی ئیبراهیم بە خزمەت کردنی میوان بەناوبانگ بووە.

لە ئایینی پیرۆزی ئیسلامیشدا، کە هەردەچێتەوە سەر ئایینی ئیبراهیم، خزمەت کردنی میوان لە لایەن پێغەمبەری نازیزمانەوە(ﷺ) فەرمانی پێ کراوەو خراوەتە پاڵ پلەی باوەڕەوە.(من کان یؤمن بالله والیوم الآخر فلیکرم ضیفه)

واتە:هەرکەس باوەڕ بە پەروەردگارو ڕۆژی زیندوو بوونەوە دەهێنێ با ڕێزی میوانی بگرێ.

(١٠) دروست کردنی ماڵێك لەسەر زەوی بەفەرمانی خوا، بۆ ئەوەی بەندەکانی پەرستشی تێدا ئەنجام بدەن، ئەوپەڕی ئاگاداریو خەمخۆری خوای گەورە پیشان دەدات بۆ بەندەکانی.

ئەم ڕاستییە دەبێت هەردەم بیرو هۆشی بەندەکانی خوادا ڕۆشن بێت، کە خوای گەورە هەموو کات ئاگاداری بەندەکانییەتیو خەمخۆری نەهامەتییەکانیانە، ڕۆژێك لەوڕۆژان دێت بەدەم پێداویستییەکانمانەوە.

## دوا ووتەو دوا زانیاری لەبارەی ئیبراهیمەوە (عليه السلام)

لە کۆتایی ئەم چیرۆکە پڕ لە خێرو بەرەکەتەدا، بە پێویستمان زانی کە لەم دوا باسەدا ئەو زانیاریانە باس بکەین لەبارەی ئیبراهیمەوە، کە لەناو چیرۆکەکەدا باسیان لێوە نەکراوە، چونکە پێویست نەبوون‌و باس کردنیان لێرەدا بەجێ ترە، هەروەك چۆن سەرەتای ئەم چیرۆکەمان بەوەسفی کەسایەتی ئەم پێغەمبەرە ئازیزە دەست پێ کرد، ئەوا کۆتایی‌یەکەشی هەر بە وەسفی دەهێنین هێشتا بەلامانەوە هەرکەمە..

١- یەکە زانیاری ئەوەیە کە ئیبراهیم لە لایەن پەروەردگارەوە کراوە بە ئیمام بۆ خەڵکی‌و خوای گەورە فەرموویەتی﴿انی جاعلك للناس اماما﴾ (البقرة: ١٢٤).

٢- بە باوکی پێغەمبەران ناسراوە چونکە هەموو پێغەمبەرانی دوای خۆی لە نەوەی ئەو بوون – واتە دوو کوڕەکەی ئیسحاق‌و ئیسماعیل (عليه السلام) – ، هەموو پێغەمبەران لە ئیسحاق، تەنها(محمد) (عليه والسلام) لە ئیسماعیل بووە.

﴿ووهبنا لإسحاق يعقوب كلا هدينا ونوحاً هدينا قبل ومن ذريته داود وسـليمان وايوب وموسى وهارون وكذلك نجزي المحسنين وزكريا ويحيى وعيسى والياس كل مـن الصالحين واسماعيل واليسع ويونس ولوطا وكلاً فضلنا على العالمين﴾ (الأنعام: ٨٤-٨٦).

٣- چەندەها جار پەنای گرتووە بە خوای گەورە لە شەڕو پیسی شەیتان بۆ منداڵەکانی (ئیسحاق‌و ئیسماعیل)، و ووتویەتی: پەنا ئەگرم بە خوای بێ کەم‌و کورت لە هەموو شەیتانێکی زەرەرمەندو هەموو چاوێکی پیس.(١)

٤- حەزی بینینی چۆنی‌یەتی زیندووکردنەوەی مردوو ئاشکراو دیار بووەو لە سەرو ئیمانی پتەوەوە، حەزی بە بینینی چۆنی‌یەتی زیندووکردنەوەی مروو کردووە.

وە داوا لە خوای گەورە دەکات کە پیشانی بدات کە چۆن مردوو زیندوو دەکاتەوە، خوای گەورەش داواکەی بۆ دێنێتە دی‌و ئیبراهیمی پێ ئارام دەکات.

ئەویش بەوەی پێی دەڵێت: چوار باڵندە بهێنێ‌و لەت‌و پەتیان بکات‌و تێکەڵیان بکات لە پەڕوگۆشت دا، پاشان بیانخاتە سەر شاخێکی جیاوازو دوور لەیەکتر، پاشان بانگیان لێ بکات، هەر باڵندەیەو بەگۆشت‌و پەڕی خۆیەوە بە زیندوویی دێنە لای، کەبەڕاستی ئەوپەڕی گەورەیی خوای گەورە لەم بەسەرهاتەدا ڕەنگ دەداتەوە.

---

(١) ئەم دوعایە پێغەمبەر(ﷺ) دەی خوێند بەسەر حسن‌و حوسێندا وەدەی فەرموو ئەمە ئیبراهیم دەی خوێند بەسەر ئیسماعیل‌و ئیسحاقدا، رواه البخاري قصص الأنبيا / ابن كثير /(ص: ١٥٧) الطبعة المخرجة.

﴿واذ قال ابراهيم رب ارني كيف تحي الموتى , قال اولم تؤمن ؟ قال بلى ولكن ليطمئن قلبي , قال فخذ اربعة من الطير فصرهن اليك ثم اجعل على كل جبل منهن جزأ ثم ادعهن يأتينك سعيا , واعلم ان الله عزيز حكيم﴾ (البقرة: ٢٦٠).

٥-جولەکەو مەسیحی‌یەکان بانگهێشتی ئەوەیان دەکرد کە ئیبراهیم لەوانە واتە جولەکە دەیوت: جولەکەیەو، مەسیحیەکانیش دەیان ووت: مەسیحی‌یە . بەلام خوای گەورە وەلامی ئەم درۆیەیانی داوەتەوەو جارێکی تر پاکیی دینی ئیبراهیم دەرخستوە لە قورئانی پیرۆزدا: ﴿ماكان ابراهيم يهودياولانصرانيا ولكن كان حنيفا مسلما﴾ (آل عمران: ٦٧).

٦-پەیڕەوو پرۆگرامی ئیبراهیم – واتە دینەکەی – دوای خۆی خوای گەورە پێغەمبەر محمد (عليه الصلاة والسلام) ی ناردووە، کە تەواوکەری بەرنامەی ئیبراهیم وە فەرمانی پێ کراوە کە لەسەر پەیڕەوو پرۆگرامی ئیبراهیمی بڕوات، کە ئەمەش ڕێزێکی گەورەیە لە ئیبراهیم، بەلام خوای گەورە بۆ محمد (عليه الصلاة والسلام) ی تەواو کردوەو هەر هەموو دینی بۆ دابەزاندوە.

﴿قل انني هداني ربي الى صراط مستقيم ملة ابراهيم حنيفا وماكان من المشركين﴾ (الأنعام: ١٦١-١٦٢).

﴿ومن يرغب عن ملة ابراهيم الا من سفه نفسه﴾ (البقرة: ١٣٠).

٧- ئیبراهیم (عليه السلام) یەکێکە لە پێغەمبەرانی(اولو العزم)[1] و خوای گەورە، ئاگاداری ناخۆشیەکانی ژیانی بووە.

٨- لە (ئیسراو معراج) ی پێغەمبەری ئازیزمان محمد (عليه الصلاء والسلام)دا باس لە شوێنی ئیبراهیم دەکات لە ئاسمانی حەوتەم، کە پشتی بە (بيت المعمور) دوەیە.

٩- شێوەو ڕوخساری ئەم پێغەمبەرە ئازیزە – واتە ئیبراهیم – بە پێی فەرموودەی پێغەمبەر محمد (عليه الصلاة والسلام)، لە شێوەو ڕوخساری پێغەمبەری ئازیزمان خۆی دەکات کاتێك هاوەلان لەبارەی شێوەو ڕوخساری ئیبراهیم وە لێی دەپرسن دەفەرموێت: ئەگەر ئەتانەوێ لە شێوەی بزانن ئەوا سەیری هاوەلتان بکەن – واتە خۆی –.

﴿... فقالوا له الابراهيم؟ قال انظروا الى صاحبكم﴾

---

[1] (اولو العزم) ئەو پێنج پێغەمبەرەن کە زۆر نارەحەتیان چێشتووە(ئیبراهیم، موسی، نوح، عیسی، محمد) .

١٠- مردنـــی ئیـــبراهیم(علیـــه الســـلام) وەك لـــه هــــەوالّی ڕاســـتیداو لەسەردەمی(مێژوونووس و ڕاڤە کەری قورئانو گێڕەرەوەی فەرموودە) (ابن کثیر)ەوە وەرمان گرتووە لە (١٦٠) ساڵی تەمەنی دا بوو و لەم قەدەرە لە تەمەنیدا کۆتایی بە خێرو بەرەکەتی هاتووە لەسەر زەوی لەلایەن خوای پەروەردگارەوە[٢].

١١- ئایا ئەو کتێبەی کە دابەزیوەتە سەر ئیبراهیم ناوی چی بووە و چۆن بووە؟

باس کردن لەناوی ئەم پەرتوکە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە کە ناوی(صحف) ە ﴿إن هذا لفي الصحف الأولى , صحف ابراهيم وموسى﴾ (الأعلى: ١٩).

لەبارەی ئەوەی کە چی تێدابووە، (ابو ذر) (رضي الله عنه) ڕۆژێك لە پێغەمبەر دەپرسێت، کە ئایا ئەو پەرتوکەی بۆ ئیبراهیم هاتە خوارەوە چی تێدا بوو؟

پێغەمبەریش لەوەڵامدا فەرمووی (بریتی بوو لە پەندوپەمونەو ئامۆژگاری)

هەروەك تێدا هاتوو کە (پێویستە لەسەر خاوەن ژیری کە چەند کاتێکی هەبێت):

- ساتێك مناجاتی خوای خۆی تێدا بکات.
- ساتێك لە نەفسی خۆی بپرسێتەوە.
- ساتێك بیر لە گەورەیی دروست کراوەکانی خوای گەورە بکاتەوە.
- ساتێك خەریکی پەیداکردنی خواردنو خواردنەوەی بێت.[٣]




سلیمانی ١٤١٩ ك ١٩٩٨/١٠/٢٨ز

(١) رواه البخاري.

(٢) قصص الأنبياء / ابن كثير / ص ١٦٩ / الطبعة المخرجة .

(٣) الرسل والرسالات / د / عمر سليمان الأشقر / (ص: ٢٤٨).

## سەرچاوەکان


١. القران العظيم.
٢. صحيح البخارى
٣. صحيح المسلم
٤. تفسير الكبير..................للامام مخرالدين الرازى.
٥. تفسير القران العضيم..........لابن كثير/الطبعه المحققه.
٦. (فى ضلال القران)........ سيد قطب/بيروت لبنان.
٧. تفسير المقتطف.............. د/مصطفى خرم دل.
٨. تفسير صفوة البيان.............. محمد حسنين مخلوف.
٩. مفردات الفاظ القران..............راغب الاصفهانى. الطبعة المحققة.
١٠. مفردات وسبب النزول............. للامام السيوطى.
١١. قصص الانبياء..................لابن كثير/الطبعة المخرجة.
١٢. قصص الانبياء..................عبدالوهاب النجار.
١٣. مع الانبياء.................... عفيف طبارة.
١٤. رحيق المختوم.................. صفي الرحمن المبار كفورى.
١٥. السيرة النبوية.................. لابن هشام/الطبعة المخرجة.
١٦. الرسل والرسالات...............د/سليمان الاشقر.
١٧. تفسيرى قورئانى پيرۆز...........م/مەلا عثمان.
١٨. فتح البارى ج٦.................. الحافظ ابن حجر العسقلانى.
١٩. تأريخ الطبرى................... امام الطبرى.
٢٠. تربية الاولاد.................. محمد نور بن عبدالحفيظ
٢١. الثقافه الداعيه................د/يوسف القرضاوى
٢٢. جامع الفريو على كتاب التوحيد......... عبدالله بن جار الله بن ابراهيم الجارالله
٢٣. مصطلحات الاربعة................. ابو الاعلى المودودى
٢٤. روح الدين الإسلامي ....  ..... عفيف طبارة

# لەم کتێبەدا

❁ بەندی یەکەم دەدوێ لە کەسایەتی ئیبراهیم و شوێنی لە دایک بوونی وئایین و پەیرەو و پرۆگرامی ئەو کۆمەڵگەیەو حاڵی ئیبراهیم تێیدا ، لەگەڵ پەندو ئامۆژگاریەکانی ئەم بەندە .

❁ بەندی دووەم گەڕانی ئیبراهیم بەدوای پەروەردگاری ڕاستەقینەدا لەخۆی دەگرێت ، لەگەڵ دەست پێ کردنی کاری بانگخوازی و ناساندنی پەروەردگاری ڕاستەقینە ، پاشان پەندو ئامۆژگاریەکانی ئەم بەندە .

❁ لەبەندی سێ یەم دا باس لەچۆنیەتی وەڵامی گەلەکەی ئیبراهیم دەکرێ ، پاشان وێنەیەك لەو ڕوبەڕووبونەوە توندو تیژەی نێوان ئیبراهیم و گەلەکەی و پەندو ئامۆژگاریەکانی.

❁ ڕوبەڕونەوەی ئیبراهیم لەگەڵ پادشای سەردەم دا و کۆچ کردنی بۆ شام و پاشان بۆ میسر و لەدایك بوونی ئیسماعیل (علیه السلام)خۆی لەبەندی چوارەم دا دەبینێتەوە لەگەڵ پەندو ئامۆژگاریەکانی ئەم بەندە .

❁ کۆتابەندی ئەم چیرۆکە کەبەندی پێنجەمە باس لەنیشتەجێ بوونی هاجەرو ئیسماعیل دەکات لەمەککە ، پاشان ڕووداوی سەربڕینی ئسماعیل و لەدایك بوونی ئیسحاق و دروست کردنی کەعبە خۆیان لەم بەندەدا کۆکردۆتەوە .

❁ پەندو ئامۆژگاریەکانی بەندی پێنجەم و دوا وتەو دوا زانیاری لەبارەی ئیبراهیمەوە (علیه السلام) کۆتاڵاپەڕەکانی ئەم کتێبەیان داگیر کردووە .

**لەبڵاو کراوەکانی کتێبخانەی تیشك**

ژمارەی سپاردنی (١٣٧) ی پێ دراوە